# فەرهەنگی

# وتەی تەنزی ناوداران

وەرگێرانی: عەلی بیروەندی

چاپی یەکەم:
2008

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما
زنجیرە(156)

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: فەرهەنگی وتەی تەنزی ناوداران
بابەت: وتەی تەنزئامێز
وەرگێڕانی: عەلی بیر وەندی
تایپ: وەرگێڕ
دیزاین و بەرگ: فواد کەوڵۆسی
شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
ساڵی چاپ: 2008 سلێمانی
نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم
تیراژ: 1000 دانە

ناونیشان: سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.
ژمارەی مۆبایل: (07701574293), (07501191847)

## ١- ڤیکتۆر برۆگ

کاری باش بابانوئێل دەیکات کە ساڵی جارێك سەردانی خەڵك دەکات.

## ٢- ئەنتۆنی پۆوڵ

ئەو بەیەکەمین نیگا یەك دڵ نا، سەد دڵی عاشقی خۆی کرد و ئێستا وئێستاش وەفادار بوو بۆ ئەو عەشقە.

## ٣- کینت تینان

ئەوەی مرۆڤ لەباری مەستیدا لە دەروونی ژنانی تردا دەیبینێ لە بەئاگا بوون لە دەروونی گار بۆ تەماشای دەکات.

## ٤- چارڵز دووەم

هەم مەستیم بینیوە، هەم باری ئاسایی، لەهەردوو بارەکەدا شتێکم تیا بەدی نەکردووە.

## ٥- جۆرج برناردشۆ

ئەوپیاوێکە خۆش ئارەزوو خاوەنی مێشکێکی زۆر تەواوە بەواتایەکی تر پیاوێکە بێ داهێنان و بێباکی لە ڕەفتار.

## ٦- جۆرج برناردشۆ

کەپیتەڵ، نووسینی کەسێکە کەلە ژیانی ئاسایی خەڵکی ئەڵمانیا و بەریتانیا پشکێکی نەبوو. ئەو ( مارکس) دەربارەی سەرمایەداران و کرێکاران وەکو پەیامنێرێکی شەڕی چین وتوێژەکان بابەتی دەنووسی نەك وەکو یەك هاوڕەگەز.

## ٧- پاتریك کامبل

(دەربارەی جۆرج برناردشۆ وگیاخواردنەکەی)

ئای لەو رۆژەی کە گۆشت بەئەوبدەن. ئیتر ژنێك لە لەندەن لەدەستی ئەو پارێزراو نابێت.

### ٨- ژان کۆکتۆ

ئەگەر بڕیار لەسەر هەڵبژاردن بێ.جەماعەت هەمیشە باراباس لە، لە خاچ دان ڕزگار دەکەن.

### ٩- وابەستە بە : جۆرزێف گوبلز

ئەم پیاوە ( هتلەر) کەسێکی مەترسیدارە، بەهەرشتێك کە دەڵێت باوەڕی پێ یەتی.

### ١٠- نەناسراو

( لیدی کیل چێرمان) لەگەورە پڕوپاگەندە کارانی ئەم سەردەمەیە، ئەو هەر کەسێك بڵێیت دەیناسێت تەنها خۆی نەبێ.

### ١١- هارولد نیکلسۆن

دەنگی ( جیمز جۆیس) ناسکترین دەنگە کە لەتەمەنمدا بیستوومە، وەکو ئاوێکی ڕەوان وهێدیە کەلە قولایدا قوڵپ قوڵپ دەکات.

### ١٢- ئیڤلین وا

دیارە بروام بەبونی ئیبلیس هەیە، ئەگەر نە چۆن دەمتوانی بوونی ( لۆرد بیڤەر بروك) هەستا پێ بکەم؟

### ١٣- کین هوبارد

تەنها ڕێگەی سەرگەرم کردنی هەندێ کەس گوێگرتنە لە قسەکانیان.

### ١٤- ئادلی ستیڤنسون

مرۆڤی برسی ئازاد نی یە.

## ١٥- جۆرج برناردشۆ

ئازادی واتا بەپرسیارێتی وەرگرتن، لەبەر ئەوە زۆربەی خەڵکان لیّ ی دەترسن.

## ١٦- جۆزێف هیلەر

ئەگەر خەڵکی ئەوەندە ئازاد بونایە کە هەرچیان بویستایە بیان پرسیایە خودا دەیزانی لەکام لەشتەکان سەردەرناهێنن.

## ١٧- جۆن ئا پریك

ئەمریکا پیلانێکی گەورەیە بۆ بەختەوەر بوونی تۆ.

## ١٨- جۆن ئا پدیك

ئەمریکا سەر زەمینێکە کەناوەندەکەی لە هیچ کویّ نی یە، بەڵام بەریتانیا سەرزەمینێکە کەناوەندەکەی هەموو شوێنێکە.

## ١٩- فرید ئالین

کالیفۆرنیا شوێنێکی خۆشە بۆ ژیان، بەمەرجیّ تۆ تیایدا وەکو پرتەقاڵ بیت.

## ٢٠- ستیڤن سپیندەر

لێهاتوویی ئەمریکاییەکان لەخۆشەویستی (دە) خولەکی لەهەر میللەتێکی تر زیاترە.

## ٢١- جیمس ئەگێت

هەر ژنێکی ئەمریکایی خاوەنی دوو ڕوحە کە دەتوانیّ بەمولکی خۆی ناوبنی ئەوی تریان رووحی مێردەکەیەتی.

### ٢٢- رۆبەرت بنچلی

لەئەمریکا سەفەرکردن دو جۆرە : پلەیەك و لەگەڵ منداڵان.

### ٢٣- ئارنۆڵد جی. توینبی

ئەمریکا سەگێکی بۆگەنی میهربانە لە ژوورێکی بچووکدا، هەر کاتێك کەکلکی دەلەقێنێ کورسیەك هەڵدەگێڕێتەوە.

### ٢٤- هینری جیمس

دوور نی یە بگەرێمەوە بۆ ئەمریکا.. دیارە بۆ مردن، بۆ ژیان، بەسەربردن هەرگیز.. هەرگیز.

### ٢٥- کلارنس دارو

کەمنداڵ بووم بەمنیان دەووت هەموو کەسێك دەتوانێ ببێ بە سەرۆك کۆمار، کەم کەم خەریکە بڕوا دەکەم.

### ٢٦- دیگ گریگوری

ئەڵبەتە چەند شتێك دەربارەی باشووری ئەمریکا دەزانم، چونکە شەوێك بیست ساڵم لەوێ گوزەراند.

### ٢٧- گیلبەرت میل ستاین

ئینگلیزی وەکو دانیشتوانی نیۆریورك بەو پەڕی رەوانی قسەدەکات.

### ٢٨- ئۆسکار وایلد

ئەمڕۆ لەڕاستیا هەموو شتێکی ئێمە لەگەڵ ئەمریکا هاوبەشە بێجگە لە زمانمان.

### ٢٩- کریستۆفەر هامپتون

ئەگەر داوام لێ بکەن سەرمایەداری پێناسەبکەم، بەم شێوەیە پێناسەی دەکەم : ڕەوشێك کەتیایدا کچانی ئەمریکایی دەگۆڕێن بە ژنانی ئەمریکایی

## ٣٠- جۆن ئۆزبۆرن

ماف ئەم مامۆستایە وەکو منداڵ پەروەردەکردن دیارە کەمە، بەڵام وەکو ڕاهێنەر بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕی یە.

## ٣١- ئالان بینت

دیارە کەلەقوتابخانەی شەوانە ڕۆژی وانەم خوێندووە، بەڵام ئێستا کە سەیری ڕابووردو دەکەم دەڵێم ناشێ ئەوێ ناوەندی چاکسازی وپەروەردە بووبێ.

## ٣٢- ئالان بینت

پەروەردە وفێرکردن لەدیدی سوسیالستەکانەوە وەکو سێکس دەمێنێتەوە هەتا پارەی بۆ نەدەی بێ ڕێگری یە.

## ٣٣- ماکس بیر بووم

لەقوتابخانە کەس لەدەستی من هەڵنەدەهات، ئۆکسفۆرد لەمن کەسێکی حەوسەڵە نەگرتووی دروستکرد.

## ٣٤- ساکی

یەکەم جار دەبێ فێر بکرێ.تۆ چی چاوەڕوانیەکت لەمنداڵێکە کە هێشتا بەقوتابخانەیەکی باش نەڕۆیشتووە، سرك و شەڕەنگێز بێت ؟

## ٣٥- جۆرج برناردشۆ

هەر کەسێ دەتوانێ کاردەکات، هەر کەسێك نەتوانێ دەرسی دا دەدات.

## ٣٦- دەبلیو.سی. سلارونارجی تیمان

لەبەرامبەر هەریەك كەس كەدەیەوێ دەرس بدات : نزیكەی (٣٠) كەس هەن كەنایانەوێ شتێك – واتا شتێكی زۆر فێر بن.

### ٣٧- فرانسیس.M.كۆرنفۆرد

هیچ كەسێكی باش بۆ پلەو پایەیەك هەڵنابژێرن مەگەر لەسات و تەمەنێكدا كە ئیتر مانای ووشەی ( نارێكی) لەبیر چووبێتەوە.

### ٣٨- تۆماس لۆڤ پیكۆك

ئەو وەكو پێویست ناردیان بۆ قوتابخانەی تایبەتی. لەوێ بەلێدان وزۆر شتێكیان فێركرد و پاشان ناردیانە زانكۆ تا لەوێ ئەو برە كەمە بە دیقەتی تەواو لەمێشكی وەدەرنێن.

### ٣٩- C.G لیختن بێرگ

زۆربەی زانست خوازان زیاتر لەوەی وەریدەگرن. نە. زیاتر لەوەی گومانی لێ دەكەن پر وپووچ پەرستن.

### ٤٠- جۆن مارشاڵ

( قوتابی بەباوكی ! )

باوكە، سەیرێكی سەراپای ئەم كارنامەیە بكە، بزانە دەتوانم نێردراوی ئەم كارنامەیە بەهۆی تۆمەتەوە بخەمە ژێر پەیگەردی یاساییانەوە.

### ٤١- رالف نادر

رەوشی سوقراتی ( لە پەروەردە و فێركردن) وەكو یاری یەكە تیایدا تەنها یەك كەس واتا مامۆستا كە دەتوانێ یاری بكات.

## ٤٢- ئۆسكار وایلد

پەروەردە و فێر کردن کارێکی دەستخۆشی یە،بەڵام جار بەجار دەبێ بێتەوە بیرمان کە ئەوەی سوودی هەیە بۆ زانین فێرکردن نیە.

## ٤٣- ئیدوار ئە پلتۆن

کاتێك لەو شتانەی کە لە ئۆپێرا دەوترێن سەردەرناکەم. ئیتر گرنگ نیە بەچی زمانێك دەوترێتەوە.

## ٤٤- نوئیل کۆوا:د

خەڵکی هەڵە دەکەن کە دەڵێن ئۆپێرا چیتر ئەو شتە نیە کە لەڕابووردوودا هەبووە. ئۆپێرا هەمان ئەوەیە کە هەبووە. کەموکورتیشی هەر لەوەدایە.

## ٤٥- موحەمەد عەلی کلای

ئەم پیاوە ناتوانێت ئاواز بخوێنێ. لەدونیادا تەنها ڕەشەکە ریتم تێناگات.

## ٤٦- ئیدگاردنەر

ئۆپێرا یانی ئەوەی کەخەنجەرێك تامشتەکەی لە پشتی کەسێك ڕۆبکەن وئەو لەجیاتی خوێن بەربوون لەژێرەوە ئاواز بخوێنێ.

## ٤٧- جۆن لینون

( لەبەرنامەی خێرخوازی : رویاڵ وڕایتی " بەئامادەبوونی خێزانی پاشایەتی ".

ڕەنگە تکا بکەم ئەوانەی کەلەبەشی بلیتی هەرزان دانیشتون چەپڵە لێ بدەن ؟

ئەوانی تریش بێ زەحمەت بەزێڕ و گەورهەکانتان شەق شەق بکەن !.

## ٤٨- هانامۆر

ڕۆیشتن بۆ ئۆپێرایش وەکو مەست بوون گوناهێکە کە سزاکەی لەگەڵ خۆیدایە، ئەویش سزایەك بەس توند.

## ٤٩- نیکولاس بوالو

بۆ دەبەنگ هەمیشە کەسێك دەبەنگ تر لەخۆی پەیدا دەبێ کەتاریفی ئەو بکات و پیاهەڵبدا.

## ٥٠- مارك توین

وەرن باسوپاسگوزاری نادانەکان بین کە ئەگەر ئەوان نەبوونایە کەسانی تر بەجێگەیەك نەدەگەیشتن.

## ٥١- وابەستە بە : مارك توین

دەمت دابخەیت و دەبەنگ خۆنیشان بدەیت باشترە لەوەی بەکردنەوەی هەمو شك و گومانێك نەمێڵیتەوە.

## ٥٢- سکۆت فیتزجیراڵد

لەهیچ کۆنگرەیەکدا بیرۆکەیەکی گەورە لەدایك نەبووە بەڵام زۆرێك لە بیرۆکە گەوجانەکان لەوێ شاردراوەتەوە.

## ٥٣- جۆرج برناردشۆ

کاتێك پیاوی گەوج لەکارێك کەدەیکات شەرمەزار دەبێت، پوزشی هەمیشە لەجێی خوێدا بێت.

## ٥٤- جیمس رۆسڵ لۆویل

تەنها مردووەکان وگەوجەکان بیروباوەڕیان ناگۆڕن.

**٥٥- هیلن رۆلاند**

مرۆڤ لەهەمووی زیاتر داخی گەوجایەتیەك دەخوات كە كاتێك دەرفەتی هەبووە ئەوەی فەرامۆش كردووە.

**٥٦- سنیكا**

كاتێك لەوەی كە ووتوومە بیر دەكەمەوە.خۆزگە بەگەوجەكان دەخوازم.

**٥٧- كاتولۆس**

بۆچی كە هیچ شتێك گەوجانەتر لە پێكەنینی گەوجانە نی یە.

**٥٨- جۆرج. S كافمەن**

دەبێ بیستبێتت كەهەندێ كەس لەبەهەشتی گەوجەكان دەژین. ئێستا گوێ بگرە كە لیونورا لەوێ یەك ئاپارتمانی بەشكۆی هەیە.

**٥٩- كتێبی پیرۆز**

گەوج هەرچی لەمێشكدا بێت لەسەر زمانێتی.

**٦٠- چارلز كلیپ كۆلتون**

تاقیكردنەوە شتێكی مەترسیدارە تەنانەت بۆ ئامادەترین كەسانێك، چونكە نادانترین كەسان دەتوانن ئەو شتانە لەدانانترین كەسەكان بپرسن كە لەوەلامدانەوەی گرفتار ببن.

**٦١- نەسقەفی گەورەی. C. گاربت**

هەرگەوجێك دەتوانێ خەوش بدۆزێتەوە هەروەك زۆرێك لەوان دەیكەن.

**٦٢- L.H مینكن**

ڕەنگە كەسێك گەوج بێ وخۆی پێ ی نەزانێت بەلآم كاتێك ژنی هێنا ئیتر شتێكی وا بوونی نی یە.

## ٦٣- ویلسۆن میزنەر

نادانی خاوەن زانیاری گەورەترە لەنادانی بێ زانیاری.

## ٦٤- S وایت

ئەگەر ڕاستە کە نەزانین بەختەوەری بێت، کەواتا بۆچی خەڵکێکی زیاتر بەختەوەر نابن.

## ٦٥- ل. ئارسەر ڤینون

بیری هەندێ کەس وەك کۆنکرێتە : تێکەڵ و پێکەڵ.و هەمیشە نەگۆڕ.

## ٦٦- بەرتراند رۆسڵ

دوو جۆر ڕەفتارمان هەیە کە شان بەشانی یەکتر لەجووڵەدان : یەکەم ڕەفتارێك کە ئامۆژگاری پێ دەکەین بەڵام کردای پێناکەین. دووەم ڕەفتارێك کە کرداری پێ دەکەین بەڵام بەدەگمەن ئامۆژگاری پێ دەکەین.

## ٦٧- جۆرج برناردشۆ

پیکەرینگ : تۆ لە ڕەفتار سەرت نابێتەوە، ئەی مەرد ؟

دولیتل : توانایم نی یە، جەنابی دادوەر

## ٦٨- جۆرج بەرناردشۆ

بڕوام بە ڕەفتار نی یە، لەپەیڕەوانی برناردشۆم.

## ٦٩- جۆن مۆرتیمەر

باوکم کە زۆر قەرزار باری ئەوم هەرگیز جیاوازی نێوان چاك و خراپی بەمن نەگوت: پێم وایە لەبەرئەو هۆکارە ئەمرۆ خۆم ئەوەندە بەقەرزارباری ئەو دەزانم.

## ٧٠- ئەلیکساندەر وّلکوت

چی بەلایەك : هەموو ئەو شتانەی خۆشم دەویٚ،یان دژ بەڕەفتارە یان قاچاخە یان قەلّەوکەر.

## ٧١- میل برۆکس

گفتوگۆکار ! تۆ بەبیٚ ڕەفتاری تاوانبارکراویت.

برۆکس : گویان خواردووە !

## ٧٢- ئۆسکار وایلد

پیاوی نەجیب بەراستی کەسیٚکە کە نەزانراو و نەخوازراو جیاناکاتەوە.

## ٧٣- G.P وود هاوس

کاری باش ئەوەیە کە پیاو داوای لیٚبوردن لەکەس ناکات. ئادەمیزادی باش پیٚویستیان بەداوای لیٚ بووردن نیە وکەسانی نادروست سوود لەم هەلەوەردەگرن.

## ٧٤- پیتەر یۆستینۆف

ئیٚرە ولاتیٚکی ئازادە،خاتوون، ئیٚمە مافی خۆمانە لەشویٚنە گشتی یەکان دەست بخەینە ناو ژیانی تایبەتی تۆوە.

## ٧٥- تۆم ستۆپ پارد

لەگەلٚ ترژایدیا کۆنەکان ئاشنایت هەیە، مەگەرنە ؟. مەبەستم کلاسیکە گەورەکانی مرۆڤــ کوژی یە.

## ٧٦- ئەنیتابرۆکنەر

دکتۆر وایس لەچلٚ سالٚیدا زانی کەئەدەبیاتی ژیانی خۆی بەباداوە.

## ٧٧- ماكس بیربووم

بەهرەی ئەدەبی ڕووداوێکی کتوپڕە، ئەم ڕووداوە لەداناییانی بەتوانا درێغ کراوە، زۆرجار بۆ گەوجەکان ئاسان دەبێ کەقسەیەکیان پێ نیە شایانی بیستن بێت.

## ٧٨- مارم توین

بەرهەمی کلاسیکی، بەهەرمێکە کەهەموو کەس حەزدەکات بیلێتەوە، بەلام هیچ کەسێك نایەوەێ بیخوێنێتەوە.

## ٧٩- هینری جیمس

مێژوو زۆر پێویستە تا هەندێ ئەدەبیات لەدایك ببێ.

## ٨٠- بنجامین دیزریلی

هەرکاتێك بمەوێ رۆمانێك بخوێنمەوە، رۆمانێك دەنوسمەوە.

## ٨١- چارلز دیکنز

وێژەوان، پیاوێکە، پێیەکانی دروستکراوە.

## ٨٢- گۆڤاری پانچ

نزیکەی هەموو ئەدیبە بلیمەتەکانی ئێمە لەدەست چوون ! کارلایل، تێنیسۆن، براونینگ وجۆرج ئیلیۆت" منیش کەئەوەندە وەزعم باش نی یە.

## ٨٣- سۆمەرست موام

رۆماننوس دەبێ وەکو مندالێ بەوشتانە باوەڕی هەبێ کە مێشك ئەوەندە گرنکی بەوانە نادات.

## ٨٤- جۆزێف هیلەر

هەموو شتێکی سەبارەت بەئەدەبیات دەزانی جگە لە چێژ وەرگرتن لیٚ ی.

## ٨٥- ڕۆبەرت لویس ستیڤنسون

بەژنهێنان فریشتەی شانی چەپت بیٚ کار دەکەیت، چونکە کاتێك خێزاندار بیت هیچ ڕێگەیەك جگە لەخۆکوژی بۆ تۆ نامێنێتەوە. تەنها دەبیٚ گویٚ ڕایەلٚ بیت.

## ٨٦- سیدنی سمیت

خێزان دروستکردن وەکو دووتیغی مقەستە.. ئەوەندە پێکەوە نووساون کە جیاکردنەوەیان ئاسان نیە، زۆرجار لەدوو ڕێڕەوەی جیاوازەوە دەجولێن ولەهەمان کاتدا هەرکەسێك بکەوێتە نیوانیانەوە لەشوێنی خۆی دا دایدەنشێنن.

## ٨٧- J.P ئۆرۆر

خێزاندار مانەوە قازانجێکی درێژماوەی هەیە. ئەگەر نامەسەلەی خێزان دروستکردنی سەرنەکەوتوو لەلایەن خزمان ودۆستان دلٚدانەوەی زۆر بەدەست دێنیٚ تا لەجیابوونەوە سەرکەوتوو بی.

## ٨٨- جۆرج ئاید

ئەگەر لەبەر دیاریەکانی ژنهێنان نەبوایە لەهەمووی باشتر دەستی ئەویتر گرتن و چوونە دەرەوە بوو.

## ٨٩- لۆرد بایرون

من مەبەستم هاوسەرگیری یە و لەبەر ئەوە گرفتاری بەدبەختیەکانی کەسێکم کە بەدوای بەختەوەری یەوە یە.

## ٩٠- لۆرد بایرون

من لەناخی دڵمەوە ئومێدەوارم کە ئێمە بەدرێژایی ژیانمان یەکترمان ئەوەندە عاشقانە خوشبوێت کە وەك بڵێ ی هەرگیز خێزانمان دروست نەکردووە.

## ٩١- گایلزبراندرت

باوك : بەهەر کەسێك لەگەڵ کچەکەمدا هاوسەر گیری بکات خەڵات دەدەم.

کلاد: بێزرە. دەکرێ سەرەتا خەلاتەکە ببینم ؟

## ٩٢- ئارنۆڵد بینت

هاوسەر بوون کارێکی هەمیشەییە. لەبەر ئەوە زۆر لەمێردەکان نوشوست دێنن. چونکە ناتوانن هەموو کاتی خۆیان بۆ ئەم کارە خەرج بکەن.

## ٩٣- ئەلیزابێس پاترسۆن بۆناپارت

( وەسیەتنامەی براکەی ئەلیزابێس لەسەردەمی ڕەنج دیتنی لەهاوسەرەکەی)

شەڕو ئاژاوە لەگەڵ هاوسەردا باشترە لەتەنهایی ودڵتەنگی بێ هاوسەری.

## ٩٤- ڤیکتۆر بۆرگ

ئا. بەڵێ. موتزارت هاوسەرگیریەکی سەرکەوتوو بوو، بەڵام ژنەکەی نە !.

## ٩٥- ئامبرۆس بیرس

ژن و پیاو لەبەرامبەر میحراب وەستان وئاگرێکیان هەڵگیرساند کەخۆیان بوون بەکەباب تیایدا.

## ٩٦- ئەنتۆن چیخۆف

پیاو وژن بۆ ئەوە پێکەوە خێزان دروست دەکەن کە هیچ یەکێکیان نازانن بەتەنیا بۆ خۆیان چی بکەن.

## ٩٧- رۆدنی دینگەرفیلد

من و هاوسەرەکەم لە ژووی جیا جیا دەنوین، نان دەخۆین، بەپشووی جیا جیا دەڕۆین وبەکورتی هەرکارێك لەدەستمان بێ دەیکەین، بۆ ئەوەی جیانەبینەوە.

## ٩٨- جۆرج برناردشۆ

شتێك کە خودای هانداوە هیچ پیاوێك ناتوانێ جیابکاتەوە. ئەمەش کاری خودی خوایە.

## ٩٩- لۆرد رۆسڵ

( کاتێك خانمێك لە لوورد ڕۆسڵ، دادوەری باڵای دادگای پرسی: ئەوپەڕی سزای پیاوێك کە دوو ژن دەهێنێ چی یە؟ وەلامی دایەوە ! )

هەبوونی دو خەسووە !

## ١٠٠- هیلن رۆلاند

پیاو پێش هاوسەرگیری ماوەیەك زۆر بێدارە و بیر لە ووتەکانی تۆ دەکاتەوە. کەچی ئێستا دوای هاوسەرگیری هێشتا قسەکانت تەواو نەبووە خەوی لێکەوتووە.

## ١٠١- هیلن رۆلاند

کچێك کە شوو دەکات سەرنجی چەندین پیاو بەبێ سەرنجی کەسێکی تر دەگۆڕێتەوە.

## ١٠٢- هیلن رۆلاند

پیاوی سەڵت هەرگیز ناتوانیّ دەست لەو خولیایە هەڵبگرێت کە هەم زۆر سەرنج ڕاکێش و هەم جوان بیّ تا هەتایی.

## ١٠٣- نیل سایمون

پاولّ : کەواتە دەتەویّ هەم دەوڵەمەن بم و هەم بەناوبانگ بۆ تۆ، وایە ؟
کوڕی : بەڕۆژ، بەلّیّ، بەلاّم شەوان دەمەویّ هەم لەگەلّ من بیت هەم لەگەلّ وەزع.

## ١٠٤- نیل سایمون

فیلیکس : ئای، بەڕاستی بەداخەوەم ( هەناسە هەڵدەکێشیّ ) شتێکی زۆر ناخۆشە.
تەلاق دەلّیم.
گویندۆلین : ڕاستە،ئەگەر پارێزەرێکی باشت نەبیّ بەراستی ناخۆشە.

## ١٠٥- نیل سایمون

ئایا دەزانیت ئاماری کەسانی خوێندەوار لەویلایەتەیەکگرتوەکان چەندە؟ (٨٦٪) ئێستا دەزانی ڕیژەی ئەو ژن و مێردانەی کە دووچاری زینا بوون چەندە؟ (٨٧٪). بەم شێوەیە ئەمریکا تەنها وڵاتی جیهانە کە تیایدا فاحیشەکار لە خوێنەری کتێب زیاترە.

## ١٠٦- ستیڤن سۆندهایم

لەکۆنسێرتەکە پێکەوە چێژ وەرگرن، دراوسێکان پێکەوە وەڕس بکەن و منالّەکان پێکەوە بەشەڕ بدەن، هەتا هاوسەریتان بەردەوام بێت.

## ١٠٧- وليام شكسپير

ئەوە بەسە کە ليسێك پياوێك لەشەڕی هاوسەرگيريەکی خراپ ڕزگار دەکات.

## ١٠٨- وليام شكسپير

لاوێك هاوسەرگيری کردبێ، هەروەك پياوێکە خۆکوژی کردبێ.

## ١٠٩ C.F فرانسيس

مۆڵەتی هاوسەرگيری وەکو مۆڵەتی ڕاوکردنە،کە مرۆڤ بەشکارکردنی ئاسکێك دەبەستێتەوە.

## ١١٠- هينری فيلدينگ

لەهەر ژن و مێردێك بەلای کەمەوە يەکێکيان گەلحۆيە.

## ١١١- جين کارلايل ( هاوسەری تۆماس کارلايل )

من هەرگيز ئەوکەسەی کەمن وتۆ بيرمان ليدەکردەوە نيم.

## ١١٢- ماکس کافمان

مانای بەختەوەری راستەقينەم نەدەزانی تا ژنم هێنا.. وئەوکاتە چيتر زۆر درەنگ بوو.

## ١١٣- سامۆيل تايلور کۆلريج

بەختەوەرترين هاوسەرگيريەك کەلە خەياڵی مندا دەخولێتەوە، هاوسەرگيری پياوێکی کەڕە لەگەڵ ژنێکی نابينا.

## ١١٤- ڕۆی کامبل

وەرگێڕان وەکو ژنە کەئەگەر جوان بێت بەدەگمەن وەفادارە.

### ١١٥- نێردراو : G.W کۆمەر.

مانگی هەنگوین کاتێك کۆتایی دێت کە پیاو لەبری ئەوەی لەشتنی قاپەکان یارمەتی ژنەکەی بدات، خۆی بەتەنها هەمووی دەشوات.

### ١١٦- ماری کورلی

دەزانی بۆچی هەرگیز هاوسەرگیریم نەکردووە؟ چونکە سێ ئاژەڵی ماڵیم لەماڵەوە هەیە کەبەهەماهەنگی کاری هاوسەرەکەمم بۆ ئەنجام دەدەن، سەگێکم هەیە کەسبەینان بۆڵەبۆڵ دەکات، توتی یەك کە پاش نیوەڕوان یەکسەر چاك و خراپ دەڵێت و پیشلەیەك کە شەوان درەنگ دێتەوە ماڵەوە.

### ١١٧- زازا گابور

پیاوی عاشق تاهاوسەرگیری نەکات ناتەواوە، کاتێك هاوسەرگیری کرد کاری تەواو دەبێ.

### ١١٨- جۆن جی

ئومێدەوار بوون بە ڕۆژگاری خۆشی بێوە بوون تەنها دڵخۆشی ژنانە.

### ١١٩- ئەبراهام لینکۆڵن

هاوسەرگیری نەبەهەشتە و نەدۆزەخ،بەرزەخە، بەرزەخ.

### ١٢٠- ئەریك لینك لەتەر

شەش مانگە ژنم هێناوە،ژنەکەم پارچەیەك گەورهەرە، شتێك هەیە هەمووی سەدو بیست ووشە دەزانێت وبەگشتی دوو بیرۆکەش زیاتر لەمێشکیدا نیە.

### ١٢١- گۆڤاری پانچ

وەسیەتێك بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێ هاوسەرگیری بکەن نەکەیت. !

## ١٢٢- گۆڤاری پانج

ئەسقەف: كیٚ یە كە بەسەر كردارو ڕەفتاری ئیٚمەوە بینەر و چاودیٚرەو، تەنانەت من لەبەرامبەر ئەودا بوونەوەریٚكی سووك وڕسوا زیاتر نیم؟

خزمەتكار : مالٚ ومنالٚ. سەروەرم.

## ١٢٣- گۆڤاری پانج

ژنیٚك دوای دوو سالٚ شووكردن: دەزانی، میٚردەكەم چیتر وەكو پیٚشوو عاشقی من نی یە. زۆربەی كاتەكەی لەدەرەوەی مالٚ بەسەردەباتن بەردەوام ساردەلەگەلٚم، كاتیٚكیش دەیٚتەوە بۆمالٚەوە ئەلٚیی زەهرە مارە، پیٚم بلٚیٚ چی بكەم.

بیوەژن : هیچ. ئەو ئاژەلٚە تیٚری بكە.

## ١٢٤- ئالفریٚد مەك فوت

ژن: بەریٚز وات،دراوسیٚی تەنیشتمان، هەموو رۆژیٚك سبەینان كاتی لەمالٚ دەرچوون هاوسەرەكەی ماچ دەكات، ئیٚستا چی دەبوو تۆیش ئەم كارەت بكردایە ؟

پیاو : چونكە من كە ژنی ئەو بەندەیەی خواناناسم!

## ١٢٥- مۆلی مەك جی

كاتیٚك پیاو بەبیٚ هۆ گولٚ بۆ هاوسەرەكەی دیٚنیٚ، بەڕاستی هۆكاریٚك لەئارادایە.

## ١٢٦- L.H مینكن

كەسانی سەلٚت زیاتر لە خیٚزاندارەكان ژنان دەناسن، ئەگەر بەدەر لەمەبیٚ ئەوانیش دەكەوتنە داوی ژنهیٚنانەوە.

## ١٢٧- ئەريك مۆركامب وئەرنی وایز

ئەریك : دەتەوێ ڕووداوی خوازبێنیم لەکچەکەیت بۆ باس بکەم ؟. ڕۆیشتم پێم ووت :" کاکی بەرێز، هەتاوی درەخشانی بزەی لێوی کچەکەتان هەوری ڕەشی نائومێدی لەناخمدا ڕەواندەوە." ووتی :" تێنەگەیشتم , دەتەوێ خوازبێنی بکەیت، ڕاپۆرتی کەشوو هەوا دەخوێنینەوە ؟ ". ووتم :" کچەکەتم وەکو هاوسەر دەوێ." ووتی :گیانە من کە تا ئێستا هاوسەرەکەتم نەدیوە ". یەکەمجار برۆ هاوسەرکەت بێنە تادوایی پێکەوە قسە بکەین ".

ئەرنی : ئاخری مەبەستەکەی خۆت تێگەیاند یانە ؟

ئەریك: ووتی :" کەواتە بڵێ دەتەوێ لەگەڵ کچکەم خێزان دروست بکەیت، باشتر نی یە سەرەتا خێزانەکەم ببینی؟ ". ووتم :" نە. کاکە. خێزانەکەتم پێشتر دیوە. لەگەڵ ئەوەشدا دەمەوێ لەگەڵ کچەکەتان ببین بەهاوسەر ".

## ١٢٨- مۆلیر

هاوسەرگیری وخوێندنەوە پێکەوە پەیوەندیان باش نی یە.

## ١٢٩- ماكس میللەر

پێش هاوسەرگیریم لەگەڵ ژنەکەم دەساڵ پەیوەندیم هەبوو، دەساڵی بەردەوام ئەوکاتە چوومە لای باوکی، دیقەتی ناوچاویم دا. ووتی :" سڵاو". ووتم :" سڵاو". ووتی " چیت دەوێ ؟". ووتم :" من دەساڵە لەگەڵ کچەکەت هاتووچۆم هەیە". ووتی : باشە.مەبەستت؟". ووتم :" ئێستا دەمەوێ ببین بەهاوسەری یەك.". ووتی :" کەپێم وابوو هاتووی مافی خانەنیشنی وەربگری". پاشان بەردەوام بوو:" ئەگەر بەراست، بەراست لەگەڵ کچەکەم خێزان دروست بکەیت گایەك وسێ گاوەخان زەوی بەتۆ

دەبەخشم". بەڵێ. بەراستی تێگەیشتی. بەتەواوی راستە. ئێستا و ئێستاش چاوەڕوانی سێ گاوەخان زەوی یەکەیم".

## ١٣٠- نەناسراو

هاوسەرگیری ناو نی یە ڕستەیە.

## ١٣١-نەناسراو

ئەگەر هاوسەرگیری نەبوایە پیاوان لەهەموو تەمەنیان بەخەیاڵی خۆش دەمانەوە کە دوچاری هیچ هەڵەیك نەدەبوون.

## ١٣٢- نەناسراو

دووهاوسەری مانای هەبوونی یەك مێردی زیادەیە، تەنها هاوسەریش هەر بەو شێوەیەیە.

## ١٣٣- نەناسراو

هاوسەرگیری تەنها جەنگێکە کە مرۆڤ تیایدا بەتەنیشت دوژمنەکەیەوە دەنوێت.

## ١٣٤- نەناسراو

هەموو هاوسەربونێك شادی بەخشە،کەموکورتیەکان لەژیانی هاوبەشدا پاش ئەوەیە.

## ١٣٥- هاورۆڵد نیکلسون

( کاتێ لێیان پرسی ئایا لەگەڵ ژنەکەی.. ڤیتا ساکڤیل وێست، چالاکی هاوبەشیان هەیە یان نە". بەڵێ، ئێمە دوو کوڕمان هەیە.

## ١٣٦- هارۆلد نیکلسون

نیشانەی دیاری هاوسەرگیری یەکی سەرکەوتوو ئەوەیە کە هەموو بەدبەختیەکان بە ڕێککەوتن بسپێری و هیچ ڕێکەوتنێك بەبەدبەختی نەزانی

## ١٣٧- ئارتموس وارد

بەشێوەیەکی مەترسیدار خێزانی دروستکردووە، ئەو خێزاندار ترین کەسە کەبەتەمەنم دیومە.

## ١٣٨- ئۆسکار وایلد

دونیا چیتر بەهەرشتێك کە هاوشێوەی ژیانی ژن و مێردێکی بەختەوەرانەیە ڕەشبین بووە.

## ١٣٩- ئۆسکار وایلد

دەپرسی هاوسەرێتی چۆن پیاو لەناودەبات، ڕێك وەکو جگەرە ئومێدت ناهێڵێ، دیارە بەخەرجیەکی زۆر قورستر.

## ١٤٠- G.P وود هاوس

هەندێ لە پیاوان ئەوەندە لە برینی زمانی ژنەکانیان دەترسن، ئەوەندە لەبرینی شمشێر ناترسن.

## ١٤١- ولیام ویچرلی

دروشمی من ئەوەیە : ئەوەی خێزان پێك دەهێنێ نادانە، بەڵام نەزان تر لەو کەسێکە کەلەگەڵ نەزانێ نابێ بەهاوسەر.

## ١٤٢- P.A هێربەرت

( ناونیشانی ڕۆمان)

هاوسەرێتی : بن بەستی پیرۆز

## ١٤٤- هینی یانگمەن

قۆناغی یەکەمی ژیانی ژن و مێردیمان بەباشی و خۆشی تێپەڕی، بەڵام ئامان لەوکاتەی کەلەئاهەنگی هاوسەرێتی گەڕاینەوە.

## ١٤٥- هینی یانگمەن

دەپرسن ڕازی بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەرێتی ئێمە چی یە. ئێمە هەفتەی دووجار دەچینە ڕستوران : مۆمێکی بچووك، نان خواردنێك، میوزیکێکی ئارام وسەمایەك، دەیارە خێزانم شەوی سێ شەممە دەڕوات و منیش شەوی هەینی.

## ١٤٦- هینی یانگمەن

دەزانی ئەگەر شەوبچیتە ماڵەوە بەتۆزێك خۆشەویستی، تۆزێك میهر و تۆزێك نەرمی ڕوو بە ڕوو ببیتەوە manای چی یە؟. مانای ئەوەیە کە زەنگی دەرگا کەت بەهەڵە لێداوە.

## ١٤٧- سامۆیل جۆنسۆن

بۆزویل : حەقیەتی ئەوەی کەمن ئسکۆتلەندیم،بەڵام ناتوانرێ کارێك بکرێ.

جانۆسن: دەزانم، کاکە، تۆ تەنها نیت، زۆری تر لەهاونیشتمانیانی تۆیش کارێك ناتوانن بکەن.

## ١٤٨- نیڤڵ دیلاشۆسە

کاتێك هەموو بەهەڵەدا چوون، هەموو ڕاست دەکەن.

## ١٤٩- C.W سلارو G.R یە تمان

( لەبەراوێزی هەڵەی کتێبێك)

لەسەرتاسەری کتێبەکە لەهەر جێگەیەك (pheasant) ( کەلەشێری کێوی) بەدیکرد تکایە بە (peasant) لادێی بیخوێنەرەوە !

**١٥٠ پەندی فەرەنسی**

هەڵەی گەورە لەپیاوانی گەورە دەوەشێتەوە.

**١٥١- سیگمۆند فرۆید**

لەم هەڵەیەوە بۆ ئەو هەڵەیە هەمو ڕاستیەکان ئاشکرا دەکەین.

**١٥٢- ئی فریمان**

کەسێك کەلەکاتی خراپ بوونی کارێك بزە دەیگرێ، ڕەنگە کەسێکی دۆزیبێتەوە کەهەڵەکەی بخاتە گەردنی ئەو.

**١٥٣- ولیام لامب، لەسەرۆك وەزیرانی بەریتانیا**

ئەوەی من دەمەوێ کەسانێکن کەکاتێك هەڵەیەکم کرد پشتیوانیم لێ بکەن

**١٥٤- ئۆسکار وایلد**

ئەزموون ناوێکە کە ئادەمیزادەکان بەسەر هەڵەکانی خۆیان دایدەبڕن.

**١٥٥- نەناسراو**

تیرهاویشتن، خاوەن دەسەلاتی لاوی شەڕگەبوو،بەلام خودا ڕەحمی بەباڵندەکان کرد.

١٥٦- لۆرد ئیلینگ دۆرت: لەم رۆژگارەی دیموکراسیدا، ناو وناوبانگ بوون مایەی دەردی سەریە، سەردەمێك منیش وەك ( جۆرج هارفۆرد) هەرچیم دەویست هەمبوو،ئێستا تەنها خاوەنی هەموو ئەوشتانەم کە خەڵکی دەیانەوێت.

## ١٥٧- دریك هیس كۆت ئەمۆری

سێ شت بەهای ئەوەی نیەکە هەڵپەیان بۆ بکەیت، پاس و ژن و ڕێکەچارەی ئابووری، ئەگەر کەمێ ئۆقرە بگری یەکێکی تر بە ڕێگاوە یە.

## ١٥٨- واڵتەر باگوت

تەنانەت یەك ئینگلیزی بەڕاستی دیاریکراو ناتوانێت بدۆزێتەوە کە بۆ مەرگی زانایەکی بواری ئابووری سیاسی لەناخی دڵەوە دڵگران بێت.

## ١٥٩- وابەستە بە : وینستۆن چەرچڵ

پاشەکەوت شتێکی زۆر باشە بەتایبەت ئەگەر باوکت ئەم کارەی بۆت کردبیت.

## ١٦٠- C.J سکوایر

من ئەوەندە شتم لەبیر نی یە کاتێ تۆمەستم دەکەیت.

## ١٦١- جۆیس ریتا بۆردیت

خووگری بەئەلکهول یاریەك نیە کە تەماشاچی هەبێ، هەریەك کەس لەخێزانێك ئەم یاریەی دەستپێکرد کەم کەم هەموویان پەیوەندی پێوە دەکەن.

## ١٦٢- وابەستە بە : دیلان تۆماس

ئەلکهولی کەسێکە کە چونکە زیاتر لەئێوە دەخواتەوە،خۆشتان بەچارەی نایەت.

## ١٦٣- سامۆیل جۆنسۆن

یەکێك لەزیانەکانی خواردنەوە ئەوەیە کە مرۆڤ کارێك دەکات کە ووشەکان لەبری بیرۆکەکان وەردەگرێت.

## ١٦٤- جروم .K.جروم

هەر لەوکاتەی کەبەسەلامەتی یەکتر دەخۆینەوە، فاتیحەی سەلامەتی خۆمان دەخوێنینەوە.

## ١٦٥- ئالین داندی

بەدەر لە (vup) لەدونیا لەهەموو شتێك زیاتر ڕقمان لە شامپانیایە.

## ١٦٦- چارلز دیکنز

بڕوای من ئەوەیە، کاکە، کە ئەم چاوپێکەوتنە خواردنەوەیە.

## ١٦٧- جۆرج برناردشۆ

ئەلکهول کاڵایەکی زۆر زەروری یە... هەر ئەو ئەلکهولەیە کە توانای ئەوەبە پەرلەمانی بەریتانیا دەدات لە کاتژمێر یازدەی شەو دەست بدەنە کارێك کەلە هیچ کەسێکی هۆشیار لەکاتژمێر یازدەی پێش نیوەڕۆ ناوەشێتەوە.

## ١٦٨- جۆزپە گریباڵدی

باکوس(خودای شەراب) ئادەمیزادەکانی زیاتر لە نیپتۆن ( خودای دەریا) خنکاندوە.

## ١٦٩ – جۆ.E. لویس

چواردە ڕۆژ پێش ئێستا ڕجیمم کرد و بەڵێنم دا کەلە خواردنەوە و زۆر خواردن دەست هەڵگرم، دەرەنجامی ئەوە لەم چواردە ڕۆژە دوو هەفتە تەمەنم کەمبووەوە.

## ١٧٠- جۆرج جین ناتان

دەخۆمەوە هەتا خەڵکانی تر سەرنج ڕاکێشم.

## ١٧١- J.P. ئۆرۆرك

بینینی پرشنگی ئومێد لە کاتی مەستیدا کارێکی سەختە.

## ١٧٢- ولیام شکسپیر

(ئەگەر)ی ئێوە مایەی دڵنەوایی یە، چەندە چاکە، لە ( ئەگەر) دا خۆی مەلاس داوە.

## ١٧٣- وودی ئالن

ئێستا مرۆڤ زیاتر لەهەر سەردەمێکی تر بەدرێژایی مێژوو لەسەر دوو رێیانێکە. رێگایەکیان بەبێزاری ونائومێدی رەها تەواو دەبێت و رێگایەکی تر بە لەناوچوونی رەها دەشکێتەوە. وەرە بپارێینەوە کە ببینە خاوەن عەقلێکی پێویست تا رێگایەکی دروست هەڵبژێرین.

## ١٧٤- بیرنارد باروك

دەنگ بەکەسێ بدە کەکەمتر لەهەموو وەعدو بەڵێن دەدات. چونکە ئەو کەسە کەمتر لەوانی تر دەبێتە مایەی نائومێدی تۆ.

## ١٧٥- هیلەر بلاك

بەرێزان.. من کاتۆلیکم.. ئەگەر ئێوە لەبەر مەزهەبەکەم دەنگم پێ نەدەن سوپاسی خودا دەکەم کەمنی لەلاوازی نوێنەرایەتی ئێوە رزگار کرد.

## ١٧٦- ئارت بوخواڵد

تائێستا هیچ کاندیدێکی هەڵبژاردنت دیوە کەلە تەلەفزیۆندا رووی قسەکانی لە پیاوێکی دەوڵەمەند بێت ؟

## ١٧٧- ئەناستاسیوسۆمۆزا( دیکتاتۆری نیکاراگوا )

ئێوە دەنگەکانتان بردەوە ومنیش ژمارەی دەنگەکان.

## ١٧٨-دروشمی لەندەن.١٩٨٣

ئەگەر دەنگدان شتێکی بگۆڕیایە تا ئێستا نایاساییان دەکرد.

## ١٧٩- فرانکلین. P جۆنس

قبولّ کردنی ڕەخنەی ڕاستگۆیانە کارێکی دژوارە بەتایبەت لەلایەن خزم و کەسوکار، دۆستان و ئاشنایان و غەریبەکان.

## ١٨٠- ئەلبێرت هاربارد

ئەگەر دەتەوێ ڕەخنەت لێ نەگرن،هیچ مەکە، هیچ مەڵێ، هیچ مەبە.

## ١٨١- وابەستە بە : جۆرج ئۆرۆڵ

هەندێ بیرۆکە ئەوەندە هەڵەیە کە پەسەندکردنیان تەنها لەکەسانی زۆر هۆشیار دەوەشێتەوە.

## ١٨٢- ترینس

هەتا ئێستا شتێك نەوتراوە کە پێشتر نەووترا بێت.

## ١٨٣- میشێل مۆنتانی

لەتەواوی جیهاندا هیچ دووباوەڕیەك لە دووکاتژمێر زیاتر ولەسەرەدەرزیەك زۆرتر یەکسان نەبوون، باوترین شێواز هەمەجۆرە.

## ١٨٤- ئەبراهام لینکۆڵن

( دەربارەی یەکێکی تر لە مافناسانی ئیلینوای بەناوی " لیۆن هریس").

لەنێوان هەموو ئەوکەسانەی کەلە تەمەنمدا بینیومە،ئەو لەهەموو باشتر دەتوانێت زۆرترین ووشە لەبێ بایەخترین هزر بگونجێنێ.

## ١٨٥- منتسكيۆ

پەندێكی جوان هەیە كە دەڵێ، ئەگەر سێگۆشەكان خودانێكیان داهێنایە، بەدڵنایی یەوە سێ گۆشەیی دروستیان دەكرد.

## ١٨٦- كۆیستۆڤەر هامپتۆن

من كەسێكم بێ هیچ بیروباوەڕێك، بەلای كەمەوە وابیر لە بیروباوەڕی خۆم دەكەمەوە.

## ١٨٧- ئۆلیڤەر ویندڵ هۆلمیس ( كوڕ )

ئامانجی سەرەكی مرۆڤەكان خستنەڕووی بیرۆكە گشتی یەكانە، وبیرۆكەی گشتیش پولێكی قەڵب نامێنێ.

## ١٨٨- هنریك ئیبسن

مرۆڤـ دەبێ چی بێت ؟. وەلامی من لەووشەیەكدا ئەوەیە : خۆی.

## ١٨٩- مارك توین

مرۆڤـ تەنها ئاژەڵێكە كە ڕووخساری لەشەرمدا سوور دەبێتەوە ویادەبێ ببێ.

## ١٩٠- ولیام سارویان

هەركەسێك لەدنیا هەر بەوشێوەیەی كەلە كەسێكی تر باشترە،بەچاكی كەسێكی تر نی یە.

## ١٩١- میلز كینگتۆن

مرۆڤـ تاكە بونەوەرێكە كەبەڕاستی كات و توانای پێویستی هەیە تا تەواوی پاشەڕۆی خۆی برژێتە دەریاوە و پاشان مەلەی تیا بكات.

## ١٩٢- بالْتازار گراسیان

مرۆڤ لە بیست ساڵیدا تاوسە،لەسی ساڵیدا شێرە، لەچل ساڵیدا ووشترە،لەپەنجا ساڵیدا مارە، لەشەست ساڵیدا سەگە، لەهەفتا ساڵیدا مەیمون و لەهەشتا ساڵیدا هیچ.

## ١٩٣- S.W جیلبرت

مرۆڤ دوا هەڵەی سروشتە !.

## ١٩٤- وودرۆ ویلسۆن

ڕەگ وریشەی مرۆڤ گرنگترە لەلقی درەخت و گەڵاکەی.

## ١٩٥- جۆرج برناردشۆ

شۆڕشەکان هیچ کاتێك باری تاکڕەویان سووك نەکردووەتەوە. بەڵکو لەشانێکەوە بۆ شانێکی تر گواستویانەتەوە.

## ١٩٦- جۆن .F.کندی

کەسانێك کەڕێگرن لەبەردەم شۆڕشێکی بێ زیاندا، ڕێگالەبەردەم شۆڕشێکی توندوتیژدا دەکەنەوە.

## ١٩٧- ئابی هافمەن

( ناونیشانی کتێبی ڕێنمایی شۆڕش )

ئەم کتێبە بدزن!

## ١٩٨- ماتیۆ ئارنۆڵد

(philistinism) (یاغنیش) ئێمە بۆ ئەم دەستەواژەیە لە ئینگلیزی هاوتایەکمان نیە، ڕەنگە لەو ڕووەوە کە خۆمان ڕاستگۆ دەربخەین.

## ١٩٩- توبیاس سمۆلیت

ئەگەر بەمن بێت دەڵێم نیوەی میللەتی ئینگلیز دێوانەن و نیوەکەی تریش ئاوەزێکی باش و ڕێکوپێکیان نی یە.

## ٢٠٠- سیدنی سمیس

جودانەبوو تر لە ئینگلیز وبیرە دووشتی ترت بەدی کردووە؟

## ٢٠١- جۆرج ئۆرۆڵ

چینایەتی ترین وڵاتی جیهان بەیتانیایە.بەریتانیا سەرزەمینی لەخۆبایی یەکان ونازدارەکان و زۆربەی کات لەژێر دەسەڵاتی بەساڵاچوان و گێلە پیاواندایە.

## ٢٠٢- ڕیمۆند پۆستگیت

سکاڵا لە گۆڕانکاری،ڕەفتارێکی نەگۆڕی هەموو ئینگلیزەکانە.

## ٢٠٣- سامۆیل جۆنسۆن

کاتێك دوو ئینگلیز دەگەن بەیەکتر، یەکەم قسەیان دەربارەی ئاو وهەوایە.

## ٢٠٤- جۆرج برناردشۆ

ئینگلیزەکان هەرگیز براوەنابن: ئەوان ئازادن هەرکارێك بکەن کەدەوڵەت و ڕای گشتی ڕێگەی پێ داوە.

## ٢٠٥- جۆرج برناردشۆ

کۆمەڵی ئینگلیز تەنها کاتێك بیر دەکەنەوە کە پاك وبێگەردن کە هەست بە نیگەرانی ناکەن.

### ٢٠٦- جۆرج برناردشۆ

ئینگلیزەکان رێز لە زمانی خۆیان ناگرن وقسەکردن بەم زمانە بەمنداڵەکانی خۆیان فێرناکەن، ئەوان ئینگلیزی ئەوەندە بەنەفرەتەوە قسەی پێدەکەن کە هیچ کەسێك سەرلەو زمانە دەرناهێنێ،ئینگلیزێك کەقسەدەکات نابێ ئینگلیزێکی تر لەخۆی بێزار نەکات.

### ٢٠٧- جۆرج برناردشۆ

ئەگەر جگەرە وقومارلەژیانی ئینگلیزەکان دابڕێت،دەبینیت کەلای کەم هەموو گەشتەکانیان لەگەڵ سەگەکانیان دەبێت.دیارە ئێستاش زۆربەیان هەر وان.

### ٢٠٨- وابەستەبە : جۆرج برناردشۆ

بەریتانیا وئەمریکا دو وڵاتن کەبەزمانێکی هاوبەش لەیەك جیابوونەتەوە.

### ٢٠٩- لۆرد گودمان

یەکێك لەئازادیە سیاسیەکانی هەرئنگلیزێك،ئازادی یە لە کلتور.

### ٢١٠- V.E . لۆکاس

ڕەفتار جوان بوون لەبەریتانیا شتێکی زۆر مەترسیدارە.

### ٢١١- جۆرج میکس

کۆمەڵی ئینگلیز ئەگەر تەنهاش بێ یەك ریزی ڕێکوپێکی یەك کەسی دروست دەکات.

### ٢١٢- مۆنتسکیۆ

ئینگلزەکان کەسانێکی سەرقاڵن، کاتێکی زۆریان نی یە بۆ بە ئەدەب بوون

## ٢١٣- جاكى ميسۆن

پیاوێکی ئینگلیز ئەگەر بکەوێتە ژێرتایەی کامیۆنێکەوە،داوای لێبوردن لە کامیۆنەکە دەکات.

## ٢١٤- ئیڤلین وا

ئینگلزی بەدبەخت وبێچارە،لەهیچ کوێدا نابینی جگە لە بەریتانیا.

## ٢١٥- ئۆسکار وایڵد

ئەو ئینگلیزێکی نموونەیی یە، هەمیشە بێزارکەر و زۆرجار توندخوو.

## ٢١٦- ئۆسکار وایڵد

من لەبەریتانیا ئارەزووی گۆرینی هیچ شتێکم نی یە جگە لە گۆرینی ئاووهەوا.

## ٢١٧- جۆن بۆریمۆر

تەنها داخی من لەشانۆدا ئەوەیە کەناتوانم لەبەردەم سەکۆی شانۆدا دانیشم و خۆمببینم.

## ٢١٨- نوئێل کۆوارد( دەربارەی "ماری باکەر ئیدی " )

ئەم ژنە لەهەر ڕوویەکەوە هاوشێوەی هتلەرە، تەنها سمێڵی کەمە.

## ٢١٩- وابەستەبە : نوئێل کۆوارد

من باوەڕم بەئەستێرە ناسی نیە، تەنها ئەو ئەستێرانەی کەمنیان بەدبەخت کردووە هەمان ئەوانەن کەلەدەوروبەرمان پەیدا دەبن.

## ٢٢٠- جۆرج گلاس

ئەکتەر لەوجۆرەکەسانەیە کە کاتێك سەبارەت بەخۆی قسەناکەیت، گوێت لێ ناگرێ.

## ٢٢١- گرۆچۆمارکس

( لەکاتی پشکنینی ترپەی دڵی نەخۆشێك)

یان ئەم کەسە مردووە یان کاتژمێرەکەی من خەوتووە.

## ٢٢٢- گرۆچۆ مارکس

من هەرگیز شێوەی بەژنی کەسێك فەرامۆش ناکەم.بەلأم لەبارەی ئێوەوە

بەوپەڕی ئارەزوو جیاتان دەکەمەوە.

## ٢٢٣- گرۆچۆمارکس ( وازهێنان لەیانە )

تکایە وازهێنانەکەم پەسەند بکەن،من مەیلم نیە ببم بەئەندامی یانەیەك

کەئامادەیە من وەکو ئەندام وەربگرێت.

## ٢٢٤- چیکۆ مارکس

( کاتێك هاوسەرکەی "مج" ئەوی لەکاتی ماچکردنی یەکێك لەکچەکانی

گروپی کۆرس بینی)

ماچم نەدەکرد، دەمویست لەناو دەمی ئاوازێك زەمزمە بکەم.

## ٢٢٥- جۆرج جین ناتان

خاتوو " مارین ئستا پلتۆن"بەشێوەیەك نواندنی دەکرد کە دەڵێ ی هێشتا

ڕێککەوتنی لەگەڵ ئامادەکاردا واژۆنەکردووە.

## ٢٢٦- ئۆسکار وایلد

من عاشقی ڕۆڵی نواندنم،ڕۆڵی نواندن پلەبەپلە واقعی ترە لەژیان.

## ٢٢٧- ولیام هازلیت

ئەکتەران تەنها ڕووپایی کارانی ڕاستگۆن.

## ٢٢٨- وودی ئالن

مێشکم ئەڵی ی ؟ دووەمین ئەندامی خۆشەویستی منە.

## ٢٢٩- لۆرد بایرون

ئەم جەستەیەی ئێمە کە دەبێ ڕۆژێ سەر لەخاکەوە دەربێنن،ئایا بەڕاستی سوودی هەستانیان هەیە؟. ئەگەر لەشی منیش دووبارە ئەوەی کە هەبوو وابێت، کە هەنگاوێ باشتر لەوەی لەم بیست ودوو ساڵە هەمبوو ببێتە بەختم، ئەگەرنە لەهات و هاواری ئاپۆرەی پەژارە لەدڵی بەهەشت دەمێنمەوە.

## ٢٣٠- ئیزاك دینسن

ئەگەر بەباشی دیقەت بدەیت مرۆڤایەتی شتێك نیە، مەگەر دەزگایەکی ووردو داهێنراو کەبەکارامەیی تەواو شەرابی ئەرخەوانی شیراز دەگۆڕێت بەمیز.

## ٢٣١- نیل سایمۆن

بەژنی ژنی جوان خۆی شاکارێکی پەروەردگارە.. هەروەها توانیویەتی بەشێوەیە دروستی بکات کەماوەیەکی زیاتر بمێنێتەوە. بەڵام دەتوانین چی بکەین،هەمیشە دەبێ شتێکمان کەم بێت.

## ٢٣٢- ولیام شکسپیر

دەبینی کە جەستەیەکی قەڵەوترم لەکەسانی تر هەیە، بەهەمان شێوە لاوازی وسستی من دیسان زیاترە.

## ٢٣٣- سيرڵ كنوڵی

لەناوخۆی هەرکەسێکی قەڵەوگۆشتن، کەسێکی لاواز زیندانی یە،کە بۆ ڕزگار بوون هاوار دەکات.

## ٢٣٤- نەناسراو

– من بۆ ئەوە لەکارەکەم دەستم کێشایەوە کەبەرپرسەکەم قسەیەکی زۆرناشیرینی بەمن ووت.

– مەگەر چی ووتوە؟

– ووتی : تۆدەرکراوی.

## ٢٣٥- ولیام ئۆسلەر

گاڵتەکردن سەبارەت بە نەخۆشیەکان وەکو چیرۆکەکانی هەزارویەك شەو بەشێکە لەسەرگەرمی.

## ٢٣٦- كینت تاینان

دەروون ئازاری ڕازێکە لەخۆتدایە و لێ ی بێ ئاگای.

## ٢٣٧- جۆرج برناردشۆ

زۆر حەز لەخولی بوژانەوە دەکەم، تەنها ئەوەیە کە حەوسەڵەیەکی زیاتر دەدا بەنەخۆش.

## ٢٣٨- ئەنتۆن چیخۆف

کاتێك بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشێك ڕێگە چارەی جیاواز دەخرێتە ڕوو، مانای ئەوەیە کە ئەو نەخۆشە بێ چارەسەرە.

## ٢٣٩- دیواری نوسراوی نیویۆرك ١٩٧٨

نەخۆشی خەیاڵی تەنها نەخۆشیەکە کەمن نیمە.

## ٢٤٠- گای فاکس

نەخۆشی بەزەحمەت چارەسەرکراو دەرمانێکی مەترسیداری دەوێ.

## ٢٤١- میل کالْمان

پیاو( لەسەر قەرەوێلّەی نەخۆشی) : تەنانەت نەخۆشی خەیالّیش، نەخۆش دەکەون.

## ٢٤٢- ئایس گودمان

باشترین چارەسەری نەخۆشی بیرکردنەوە ئەوەیە کە جەستەی خۆت لەبیر ببەیتەوەو حەزبە جەستەیەکی تر بکەیت.

## ٢٤٣- فلۆرانس نایتینگلْ

یەکەمین مەرج بۆ نەخۆشخانە ئەوەیە کە زیان بەنەخۆشەکان نەگەیەنێت.

## ٢٤٤- تۆنی بلاك بۆرن

بەڕاست کێ ووتویەتی پاپ لەمن نزیك تر بێ لەخواوە ؟

## ٢٤٥- پاپ جۆنی بیست و سێ یەم

چەندین جار ڕودەدات کەشەو لەخەو ڕادەپەڕم، سەبارەت بەبابەتێکی گرنگ بیر دەکەمەوە و دێمە سەر ئەوەی بڕۆم ئەو باسە لەگەلْ پاپدا ڕاوێژی لەسەر بکەم.

پاشان کەبەتەواوی لەخەو هەلّدەسم دەبینم پاپ خۆمم.

## ٢٤٦- جۆن نۆزبۆرن

پاشایەتی زێڕێکە کە ددانێکی پوکاوی پێ پڕ دەکرێتەوە.

## ٢٤٧- ئیدواردی حەوتەم

( کاتێ لە ئیدواردی حەوتەمیان پرسی ئایا لەگەڵ شاژنە ڤیکتۆریا لەبەهەشت خۆش دەگوزەرێ، لەوڵامدا ووتی :

لەوێ دەبێ لەپشتی سەرفریشتەکانەوە بەڕێگا بڕۆی و ئەمەش شتێك نیە کەئەو حەزی لێ بکات.

## ٢٤٨- شاژنە ماری ئەنتوانێت ( هاوسەری لویسی شازدە )

( دوای بیستنی ئەم هەواڵە کەهاوڵاتیان نان نی یە بیخۆن)

کەواتە کێك بخۆن ! .

## ٢٤٩- ڕاڵف والدۆ ئیمرسۆن

کاتێك تیر دەهاوێژیتە سوڵتانێك حەتمەن دەبێ بیکوژیت.

## ٢٥٠- ماکس بیر بووم

( دەربارەی کارولین ئاوبرۆنزویك، هاوسەری جۆرجی چواردەهەم).

چارەنووسێکی تراژیدی شکۆمەند هاتە ڕێگەی و ئەو لەسەرتاسەری نمایشەکە بە کۆلۆنێکەوە ڕۆڵی دەبینی.

## ٢٥١- جۆرجی دووەم

( کاتێك شاژنە کارولین لەسەرەمەرگ بەپێداگری لەجۆرجی دووەم داوای کرد کە دوبارە لەسەر جێگە ڕاکشێت).

– نە. ئیتر ژن ناهێنم: هاوڕێ پەیدا دەکەم.( شاژن لەوەڵامدا ووتی)،ئای جیاوازی نیە.

## - ٢٥٢- دوك ويلينگتۆن

( کاتێك ئاپۆرەی کۆمەڵێ خەڵك دۆك ویلینگتۆنیان ناچارکرد کە بۆ شاژنە کارۆلین کەبەبێ بەندو بار ناسراوبوو هاودەردی بکات. ووتی " )

شاباتۆ بەسەلامەت بێ و ژنان ئێوەش وەکو ئەو !

## ٢٥٣- وابەستە بە : تیۆدۆر ڕۆزفلت

( ئیمپراتۆری لەئەڵمانیا لەمەراسیمی ناشتنی تەرمی ئیدواردی حەوتەم داوای لە تیۆدۆر کرد کەسبەی ڕۆژی دوایی لەکاتژمێر دوو بڕوات بۆ دیداری و ووتی : چونکە تەنیا (٤٥) خولەك دەتوانم کاتتان پێ بدەم." تیۆدۆر ڕۆفلت لەوەلامدا ووتی ")

دیارە لە کاتژمێر (٢) دێم. بەڵام بەداخەوە زیاتر لە(٢٠) خولەك ناتوانم کاتتان پێ بدەم.

## ٢٥٤- کاترینی گەورە

من تاکرەوی دەکەم بەپیشەم،بۆچی کەداب و نەریتی من ئەمەیە و پەروەردگاری میهرەبانیش من دەبەخشێت کەداب و نەریتی ئەویش وابووە

## ٢٥٥- لویسی چواردەهەم

( کاتێك بەریتانیا دووهەفتە دوای دەست بەکاربوونی شاژن "ئان" لەگەڵ لویسی پاشای فەرەنسا شەڕی ڕاگەیاند").

کاتێك ژنان لەگەڵ مندا شەڕ ڕادەگەیەنن، مانای ئەوەیە کە چیتر من پیر بووم.

## ٢٥٦- وابەستە بە : شاژنەماری

( دوای ئەوەی هەواڵیان دابە شاژنە ماری کە یەکێك لەتابلۆکانی شاهانە بەرهەمی " مەرسیە" نەك " نولکینز"'.)

من دەوبارەی دەکەمەوە کە ئێستاش بەرهەمی نولکینز بێ.

## ٢٥٧- مەلیك فاروق، پاشای میسر

ڕۆژێك دا دێت کە لەتەواوی دونیا پێنج شا زیاتر نامێنێ، شای دڵ، شای پەیك، شای خشت، شای خاچ و شای بەریتانیا.

## ٢٥٨- وابەستە بە : ناپلیۆن

( دەڵێن شەوێك پێش جەنگێکی گرنگ، جۆزفین لەناپلیۆن نزیك دەبێتەوە کە سەخت ڕۆچو بووە بیرکردنەوەوە.. ) ئەمشەو نە،جۆزفین.

## ٢٥٩- نەناسراو

( هەجوویەك بەشاژنەکاورلین کەبەدکاریەکەی بووە وێردی سەرزمانی هەمو خەڵك)

شابانۆی ناوبانگ بەبەخشش

بڕۆ وبەدووریە لە خراپەکاری

ئەم دووە لەسەرووی توانای تۆیە

بڕۆ دوور بەو هەرچیت دەوێ بیکە.

## ٢٦٠- نەناسراو

( ئەنجومەنی پیران بۆ باسکردن دەربارەی گەلاڵەنامەی سزاوتاوان کۆدەبنەوە،جۆرجی چواردەهەم نیازی نیە بەپەسەندکردنی ئەم گەلاڵەنامە

کارولین ئاوبرۆنزیوك, هاوسەری واز لێ هێنراوی خۆی تەلاَق بدات، کارولین لەم دانیشتنە بەشداری دەکات بەلاَم وەك هەموو جار خەوی لێ دەکەوێت) پەنابۆ خودا : ئیتر کەسێك پێشگیری ناکات، دەربارەکان لاچن، لەگەڵ نوێنەرانی پیرانیش دەخەوێت.

## ٢٦١- ولیامی چوارەم

( کاتێك ولیامی چوارەم لەخەو هەڵدەسێنن هەتا هەواڵی بەپاشا بوونی پێ بدەن،گەڕایەوە سەرجێگەکەی ووتی :") جارێ لێم گەڕێن لەنووستندا با لەباوەشی یەك شاژنا بەهرەمەندبم".

## ٢٦٢- وودی ئالن

شێر و گۆلك دەتوانن لەلای یەك بخەون، بەلاَم گۆلکەکە بەباشی خەوی لێ ناکەوێت.

## ٢٦٣- جۆن بیلینگز

سەگ تەنها بوونەوەرێکی سەرزەوی یە کە تۆی لەخۆت زیاتر خۆشدەوێت.

## ٢٦٤- .A. توسنیل

هەرچی زیاتر پیاوان بناسی، زیاتر ڕێزی سەگەکان دەزانی.

## ٢٦٥- وینستۆن چەرچل

من بەرازم خۆشدەوێ،سەگەکان لەئاستێکی نزمەوە سەیری مرۆڤ دەکەن وپشیلە لەئاستێکی سەرووتر،لەمنێوانەدا. بەرازەکانن ئێمە بەچاوێکی یەکسان سەیر دەکەن.

## ٢٦٦- جۆرج برناردشۆ

کاتێك مرۆڤ دەیەوەێ پڵنگێك بکوژێت ناوی دەنێت شکار و سەرگەرمی،بەڵام ئەگەر پڵنگ بیەوێ ئەو ڕاوبکات پێ ی دەڵێت دەڕندەیی.

## ٢٦٧- میلزکینگتۆن

جاڵجاڵۆکەکان لەسروشتدا کاری یەکەی هەوایی بەریتانیا دەکەن. چەندین کاتژمێر بەتەنافەکانیان لەهەوادا دەسوڕێنەوە وکاتێك دینە خوارەوە و مێروولەیەکی حەپەساو بێ ڕەحمانە بەپرسیار دەپێچنەوە، پرسیارەکانیشیان زۆر جار یەکێکە: وەسیەتت چی ؟".

## ٢٦٨- فران لیبویتس

ئەوسەگانەی کەبەبەشداری کردنیان لە ڕیکلامەبازرگانیەکان مووچەیان دەست دەکەوێت بەسوور بون و حەزێکی تەواوداوای گۆشت دەکەن. دەبێ لەبیریان بێ کەبەلای کەم لەیەکێك لەولاًتانی ڕۆژهەلاتی دوور خۆیشیان، گۆشتیان دەخورا.

## ٢٦٩- A.A میلن

ئیور،وولاغی پیری بۆر. لەتەنیشت ڕووبارێکی ئاودا وەستا، سەرنجی خۆیدا لەناو ئاوەکە ووتی :" غەمناکە، غەمناك. دەتوانم چی بکەم!".

## ٢٧٠- سنت ئاگوستین

خودایە: بەمن خۆپارێزی و پاکداوێنی ببەخشە،بەڵام ئێستانە!.

## ٢٧١- ولیام ئۆسلەر

ئارەزووکردن لەدەرمان خواردن گەورەترین تایبەتمەندیە کە مرۆڤەکان لە ئاژەڵەکان جیادەکاتەوە.

## ٢٧٢- ئادەم دی پتوو

ئیتر ئازاری ( سادیست) بەپزیشکیَ دەلێن کە ماندی تەلەفونەکەی لەیەخچاڵەکەی هەڵگرتووە.

## ٢٧٣- ماتیوپریۆر

هەر دوێنیَ لەنەخۆشی چاك بوومەوە وهەردوێنیَ شەو بەدەستی پزیشکەوە بەرەوئەو دونیا ڕۆیشتم.

## ٢٧٤- نیل سیمۆن

حەوسەڵەی بیستنی چپە چپم نیە، هەرکاتێك پزیشکێك لەنەخۆشخانە چپەچپ دەکات، ڕۆژی دوایی بەخاك سپاردنی تەرمێکە.

## ٢٧٥- هیرب شراینەر

پزیشکەکەی ئێمە دەست بەنەشتەرگەریەکە ناکات مەگەر کاتێك کە هەست بە زەرورەت بکات، بەم جۆرە بوو ئیتر. کاتێك پێویستی بەپارە نەبوو. مەحاڵ بوو دەستت پێوە بدات.

## ٢٧٦- جیمس شیرمەن

دکتۆر ( لەکاتی پێدانی وەسڵ بەنەخۆش :) ئەگەر ئەم دەرمانە کاریگەر بووئاگادارم بکە. چونکە خۆشم هەر ئەو نەخۆشیەم هەیە.

## ٢٧٧- سام گۆلدوین

هەرکەسیَ کە دەڕوات بۆ لای پزیشکی دەروونی دەبیَ مێشکی بپشکنیَ.

## ٢٧٨- ئۆگەستوس

بەئارامی هەستە.

## ٢٧٩- ئەلکساندەر پۆپ

مرۆڤ نابێ لەقبوڵکردنی بەرەنجامی هەر هەڵەیەك لەلای خۆیەوە شەرمەزاربێ. بەواتایەکی تر، قبوڵکردنی هەڵە بەومانایەیە کە ئەمڕۆ داناتری لەدوێنێ.

## ٢٨٠- جۆن سلدین

ڕەوانبێژان دەڵێن : ئەوەی دەڵێم بیکە. نەك ئەوەی دەیکەم.

## ٢٨١- جۆرج برناردشۆ

هەوڵبدە ئەوەی حەزت لێیە بەدەستی بهێنی و گەرنە ناچار دەبیت هەرچی بە دەستت هێنا خۆشت بوێت.

## ٢٨٢- پەندی پێشینانی ئەڵمانی

کاتێك ڕێوی ئامۆژگاری بکات. ئاگاداری کەڵەشێر و مریشکەکانتان بن.

## ٢٨٣- ئۆسکار وایلد

پەندو ئامۆژگاری هەمیشە لەگەڵ کەسانی تر دەگۆڕمەوە. کارێکی تری لەگەڵ ناکرێ.ئەم شتانە هەرگیز بەکەڵکی خودی مرۆڤ نایەت.

## ٢٨٤- تۆماس بیلی ئاڵدریچ

هەبوونی زێڕ کەسانێکی کەمی هیوا بڕاووکردووە.تا نەبوونی زێڕ.

## ٢٨٥- ڤیك ئۆلیڤەر

ئەگەر کەسێك بەدوای پارەدا ڕاکات دەڵێن شێتی پارەیە: ئەگەر پارەپاشکەوت بکات دەڵێن سەرمایەدارە : ئەگەر پارەخەرج بکات دەڵێن خۆشگوزەرانە: ئەگەر پارە بەدەست نەهێنی دەڵێن بێ غیرەتە وئەگەر بۆ دەوڵەمەندی کۆشش نەکات دەڵێن بەرزناڕوانێت. ئەگەر بەبێ کارکردن پارە بەدەست بهێنێ دەڵێن بەلاش خۆرە وبەکورتی ئەگەر دوای تەمەنێك

پارەیەکی کۆکردبێتەوە دەڵێن لەو گێلەپیاوانە بوو کەلەژیانیدا شتێك تێنەگەیشت.

## ٢٨٦- نێردراوی : هینری بۆتۆن

ملیونێرێکی ئەمریکایی بەکوڕەکەی : سەیرکە کوڕەکەم.پارە هەموو شتێك نیە بۆ ئادەمیزاد. پیاوێك کە(٩) نۆملیۆن دۆلاری هەبێ دەتوانێ بەقەد کەسێك کە دەملیۆن دۆلاری هەیە. بەختەوەر بێت.

## ٢٨٧- جیمس باڵدوین

پارە هەروەکو پەیوەندی سێکسی وایە کە هەتا دەستت پێ ی نەگات، مگەلە لەوبیر لە شتێکی تر ناکەیتەوە. وەکاتێك پێ ی دەگەیت بیر لە شتی تر دەکەیتەوە.

## ٢٨٨- P.J دانلۆفی

کاتێك پارەت نەبێ کێشەت خوارنە،کەپارت بەدەست هێنا هەڵوەدای سێکسی، کاتێك هەردوکیانت دابین کرد، گرفتاریت سەلامە تی یە.

## ٢٨٩- بنجامین فرانکلین

ئەگەر دەتەوێ قەدری پارە بزانی برۆ لەکەسانی تر داوای قەرز بکە.

## ٢٩٠-سامرست موهام

پارە وەکو هەستی شەشەمە کە بەبێ ئەو ناتوانیت لە پێنج هەستەکەی ترت بەهرە وەربگریت.

## ٢٩١- مارگرێت کەیس هاریمان

پارە شتێکە کە بەبێ ئەو دەتوانرێت ژیان بەسەر بەریت بەمەرجێك کەسانی تر بۆ پارە ئەوەندە هەڵپەیان نەکردایە.

## ٢٩٢- هۆراس

بەهەر شێوەیەك كە بكرێ لە ڕێگایەكی شەرافەتمەندانە و ئەگەر نەبوو لەهەر ڕێگەیەكەوە كە بكرێت پارەدار بە.

## ٢٩٣- كاترین وایت هۆرن

بنەمایەكی گرنگمان هەیە كە دەڵێت لەگەڵ كەسانێك كە زۆر زیاتر یان زۆر كەمتر لەتۆ پارەیان هەیە، نابێت لەبارەی پارەوە قسەبكەیت.

## ٢٩٤- لۆگان پیرساڵ سیمس

بەدبەختی دەوڵەمەندبوون لەودایە دەبێ لەگەڵ دەوڵەمەندەكان بژیت.

## ٢٩٥- مارگۆت ئسكوت

ئێستا ئیتر ڕزقی من بووەتە ماكارۆنی و كۆڕی خزمەتكردن.

## ٢٩٦- بارونیس ستۆكس

كۆڕی پیاوماقوڵان خەڵوتگەیەكی پیری تەواو مانایە.

## ٢٩٧- J.P ئۆرۆرك

سەبارەت بە پیران شتێكی تر هەیە كە زۆر مەترسیدارە و ئەویش ئەوەیە منیش بەزویی دەبمە یەكێك لەوان.

## ٢٩٨- بیرنارد بارۆك

پیری هەمیشە لەلای من یانی پازدە ساڵ زیاتر لەتەمەنی خۆم.

## ٢٩٩- یوبی بلاك

( لەسەد ساڵیدا)

ئەگەر دەمزانی ئەوەندە زۆر دەژیم، زیاتر ئاگاداری خۆم دەبووم.

### ٣٠٠- نێردراو : H.W بۆرن

ئەگەر بیر لە قۆناغەکانی دوای پیری بکەیتەوە،دەبینی پیری ئەوەندەش خراپ نیە.

### ٣٠١- ئەلکاسندەر پۆپ

کاتێك مرۆڤەکان لەکاتی پیری خۆپارێز دەبن لەراستیا لەپاشماوەکانی شەیتان بۆخودا قوربانی دەبەن.

### ٣٠٢- لیۆن ترۆتسکی

پیری چاوەڕوان نەکراوترین شتەکەدێت بەسۆراخی مرۆڤەوە,

### ٣٠٣- جۆرج برناردشۆ

ئینسان بەخوێندنەوەی دەفتەری بیرەوەریەکانی خۆی بەشێوەیەکی چاپکراو هەست بە پیری و غەمباری دەکات.

### ٣٠٤- لیۆ ڕۆزەنبێرگ

یەکەمجار ناوەکان لەبیر دەکەیت، پاش کەمێك شێوە ڕوخسارەکان، ئیتر وات لێدێت داخستنی زنجیری پانتۆڵەکەت لەبیر دەکەیت و لە کۆتایش کردنەوەی.

### ٣٠٥- ستیڤن فرای

پێویست ناکات تۆ تەمەنی پیری بخەیتەوە بیرم، خۆم میزڵدانم هەیە کە ئەم کارەم بۆدەکات.

### ٣٠٦- نەناسراو

پزیشك : تۆ تا هەشتاساڵی تەمەن دەکەیت.

نەخۆش : من هەر ئێستا هەشتا ساڵم.

پزیشك: باشه، مەگەر من چیم ووت ؟.

## ٣٠٧- y.E. هاربۆرگ

لەچلّ ساڵیدا هەستم لەدەست دا، لەپەنجەنا ساڵیدا مووی سەرم، لەشەست ساڵیدا ئارەزووەکانم و ددانەکانم لەدەست دا و پێیەکانم لە رۆیشتن پەکی کەوت.

هەشتا ساڵی دەست و پێی بەستم و ئێستا چەماوە و دڵشکاو وسەربەئەژنۆ بووم و بیّ هیوا نابم لەژیان، چونکە گەوجایەتیم هێشتا سەلامەت و دەست لێنەدراوە.

## ٣٠٨- بۆب هۆپ

کاتێك نرخی مۆمەکان زیاتر بوو لەنرخی کێکی لەدایکبوونت، بزانە کە ئیتر چوویتە ناودونیای پیری یەوە.

## ٣٠٩- ئەمبرۆس بیرس

مێژوو راپۆرتێکی زۆرجار درۆیە لەواقعێکی زۆر جار بیّ بەهایە کەبەدەستی زۆر لەدەسەڵاتدارانی نابەجیّ وسەربازانێکی زۆر گەوج ئامادە ودروست دەکرێت.

## ٣١٠- P.J.A تایلۆر

وەکو زۆربەی ئەو کەسانەی کە مێژوو دەخوێننەوە ئەو( ناپلیۆنی سیّ یەم) دیسان لەهەڵەکانی ڕابردوەوە فێربوو کە چۆن تووشی هەڵەی تازە بێت.

## ٣١١- جۆرج برناردشۆ

هیگلّ ڕاستی دەکرد کە دەیگوت ئەوەی ئێمە لەمێژوو فێری دەبین ئەوەیە کە مرۆڤەکان هەرگیز لە مێژوو شتێك فێر نابن.

## ٣١٢- جۆرج برناردشۆ

سویندۆن ": مێژوو چ دەڵێت ؟

برگوین :" مێژوو هەروەك هەمیشە، قوربان، درۆ دەكات.

## ٣١٣- فلیپ گویدالا

مێژوو خۆی دوبارە دەكاتەوە و مێژونوسانیش یەكتری.

## ٣١٤- كارڵ ماركس

هیگڵ لەشوێنێكدا دەڵێ هەمو ڕووداو وكەسایەتیە گەورەكانی مێژووی جیهان سەرلەنوێ بەشێویەكی تر پەیدا دەبن، بەڵام لەبیری چووە ئەوە زیاد بكات كە: جاری یەكەم بەشێوازێكی تراژیدی و جاری دووەم بەشێوازێكی كۆمیدی.

## ٣١٥- نەناسراو

دوای بیستنی باسكردنی ڕووداوێك لە زمانی دوو شاهیدی بینراوو، ئینسان یەكسەر بیری مێژووی دەكەوێتەوە.

## ٣١٦- مارگرێت هوسی

یەكێك لە هۆكارەكانی كە مێژوو( وتەكانی) خۆی دوبارە دەكاتەوە، ئەوەیە كە زۆر لە خەڵكان یەكەمجار گوێ ناگرن.

## ٣١٧- جۆرج ئۆرویل

ڕاگەیاندن وەكو تەق و پۆقی تەختەیەكە لەناو تەنەكەی خۆڵ.

## ٣١٨- ئیدگار هاتسون هاو

بازرگانی كردن بەبێ ڕاگەیاندن وەكو عەینەكێكە لەتاریكی بەكچێك بدرێت خۆت دەزانی چی دەكەیت بەڵام كەسانی تر نازانن.

## ٣١٩- ئەرستۆلّ ئۆناسیس

نیشانەی بازرگانی زانین شتێکە کەکەسێکی تر نایزانێت.

## ٣٢٠- ئەلکساندەر دۆما باوك

بازرگانی دەلّێ ی؟ زۆر ئاسانە. واتا پارەی ئەوانی تر.

## ٣٢١- ولیام ڕیگلی ( کوڕ )

کاتێك دووکەس لەکاروباری بازرگانیدا بەردەوام هاوڕان. یەکێکیان زیادەیە.

## ٣٢٢- ئەندرۆ یانگ

کاتێك سەد کەسی پارەدار بڕیار لەسەر کارێك دەدەن، هیچ شتێك

پێچەوانەی یاسانی یە، ئەم بنەمایە لەهەموو جێگەیەکی دونیا ڕاستە.

## ٣٢٣- جۆرج سانتیانا

ئەوانەی کەلە وەبیرهاتنی ڕابووردو بێ توانان، تاوانبارن بەدووبارە

بونەوەی.

## ٣٢٤- پەندی بەلژیکی

ئەزموون شانەیەکە کە سروشت زەمانێك دەیداتە دەستی ئێمە کە کەچەلّ

بوین.

## ٣٢٥- هارۆلد مەك میلان

( لەکاتی ووتاردانی ٢٩ی سێپتەمبەری سالّی ١٩٦٠ لە ڕێکخراوی نەتەوە

یەککگرتوەکان. لەکاتێك کە خرۆشۆف پێلاوەکەی دەدابە سەرمێزەکە).

باش تێناگەم. ڕەنگە باشتر بێ یەکێك تەرجومەی بکات.

## ٣٢٦- جیمس هاوڵ

لەیدی هەندێ کەسەوە وەرگێڕان جیاواز نیە لەدیوی پشتەوەی فەرشێکی دەستچنی تورکی.

## ٣٢٧- مارك توین

بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی واسواسە چەند ڕێگەیەکی باش هەیە کە دڵنیاترینی ئەوانە ترساندنە.

## ٣٢٨- ئالان ئیکبۆرن

لەکاتی زمان لوسی لەگەڵ ژنان دەبێ زۆر زیاتر وریا بی، بەڵام لەبارەی پیاوانەوە هیچ مایەی نیگەرانی نیە چونکە هەرپیاهەڵدان و دەست خۆشیەك بەبێ درەنگ لە بارەی خۆیانەوە دەبیستن.

## ٣٢٩- مارك توین

بەپیاهەڵدان و دەستخۆشیەکی باش دەتوانم دوومانگ بژیم.

## ٣٣٠- کین هوبارد

هەندێ کەس جۆرێك ئینسان دەناسێنن وپیاهەڵدەڵێن کە دەڵێ ی چەکی پارەیان دەوێت.

## ٣٣١- ڕابیندرانات تاگور

دەمارگرژی بۆ پاراستنی ڕاستی ئەوەندە توند لەچنگدا دەیگوشێ کە خەفەی دەکات.

## ٣٣٢- وینستون چەرچل

کاتێك " هیلین ئاگدن میلز ڕید" خوشکی خاوەن ئیمتیاز دژی بەریتانیایی شیکاگۆ تریبیۆن لەساڵی ١٩٤٢ لە میوانداری نیوەڕۆخوانێکدا لە کۆشکی

سپی ڕووبەڕووی چەرچڵ بوەوەو ئەوی بەهۆی سیاسەتی بەریتانیا لە هند خستە بەرگازندەو ووتی :"

پێش ئەوەی زیاتر بچینە پێشەوە لێم گەڕێ سەرەتا شتێك ڕوونبکەمەوە. ئایا ئێمە دەربارەی هندیە ڕەنگ قاوەیی یەکان قسەدەکەین کەلە لیوای بەریتانیا ڕۆژ بە ڕۆژ بەشێوەیەکی ترسناك ڕوو لە زیاد بوون دەکەن یان سەبارەت بە هندیە سوور پێستەکانی ئەمریکا کەتا ئەو جێگەی کەمن زانیارم هەیە لەحاڵەتی لەناوچووندان ؟.

## ٣٣٣- سێر .W. درۆمۆند

ئەوەی کە نایەوێ بەڵگە بهێنێتەوە دەمارگیرە:

ئەوەی توانای بەڵگە هێنانەوەی نیە گێلە و ئەوەی بوێری بەڵگەهێنانەوەی نیە کۆیلەیە.

## ٣٣٤- نیکۆلاس سباستیان چامفۆرت

یان برام بە یان دەتکوژم.

## ٣٣٥- بەرتراند ڕاسڵ

یەکێك لە نیشانەکانی نزیکبوونەوە لە قەیرانی دەروونی ئەوەیە کە بیر بکەیتەوە کەکارەکەت زۆر زیاتر گرنگە. ئەوەندە کە ئەگەر بەپشوو بڕۆیت ئاسمان وزریسمان یەکدەگرێت.

## ٣٣٦- ئێریل ویلسۆن

چەندەخۆش دەبوو ئەگەر دوو هەفتەی پشوودان بەقەدەر دوو هەفتەی رجێم گرتن درێژەی بکێشایە.

## ٣٣٧- جۆرج ئیلیۆت

وەکو کەڵەشێر بوو کە پێی وایە هەتاو بۆ قووقوو قوی ئەوە کە هەڵدێت.

## ٣٣٨- تۆماس ئۆڤەربووری

کەسێك کەتنها ئەژدادی مایەی شانازی ئەو بێ بێهاوشێوە نیە لەگەڵ

پەتاتە کە ڕەگ و ریشەی بنەڕەتی لەژێر خاك پەنهانە.

## ٣٣٩- دوروتی پارکەر

( کاتێ بە دوروتی پارکەریان ووت کە:" کلار بوس لۆس". لەگەڵ ژێر

دەستەکانیدا هەمیشە بەمیهرەبانی ڕەفتار دەکات ووتی:"

ئێستا ئەم ژێر دەستانە لەکوێ دێنێت؟

## ٣٤٠- وینستۆن چەرچل

( چەرچل لەکاتی هاتنەدەرەوە لەحەمام ڕووبەڕووی ڕۆزفلت دەبێتەوە،

کاتێ دەبینێ ڕۆزفێلت حەپەساوە. دەڵێ :

نیگەران مەبە. سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا شتێکی نیە کەلە سەرۆك کۆماری

ئەمریکای بیشارێتەوە.

## ٣٤١- نوسراوی سەردیواری لەندەن

دەمەوێ هەمان ئەوشتە بم کە کاتێك دەمویست شتێك بم کەئێستا

هەمبوایە.

## ٣٤٢- فرانکلین D. ڕۆزفێلت

( دەربارەی ژنەراڵ دۆگلاس مەك ئارسەر ").

هەرگیز کەسێك کە خۆی بەئاستێکی بەرزتر دادەنێت بەکەمتر سەیری

مەکە.

## ٣٤٣- ئەدیت سیتویڵ

دەیان جار ئارەزووم ئەوەبووە کە دەرفەتێکم هەبوایە خۆم بۆخۆبەکەم زانی ئامادە بکردایە، بەڵام چی بکەم کەئیشی زۆر دەرفەتێکی بۆخۆتەرخان کردن بۆ ئەوکارە نەهێشتوەتەوە.

## ٣٤٤- ولیام شکسپیر

لەگەورەیی ترسان: پیاوانی گەورە لەدایك دەبن و کەسانی تر گەورەیی بەدەست دێنن وهەروەها هەن کەسانێك کە گەورەیی دەخرێتە ئەستۆیان.

## ٣٤٥- لۆرد لانگ فۆرد

من لەساڵی ١٩٦٩ کتێبێکی بچوکم دەربارەی لەخۆبووردویی بەچاپ گەیاند کە دەسپێکی ڕێگابوو تا ئەوجێگەی من ئاگادارم کتێبێکی تر نەیتوانیوە پێشی بکەوێت.

## ٣٤٦- ئۆسکار وایلد

شتێك کە دونیا پێویستێتی ژمارەیەکی زۆرتری بلیمەتی لەخۆ بووردوە. بەداخەوە ژمارەمان زۆر کەم بووەتەوە.

## ٣٤٧- تۆم لوهرمر

کاتێك مۆتزارت لەتەمەنی مندا بوو، ساڵێك بەسەر مردنیدا تێپەر ببوو. ئەم وریاکردنەوەیە دەبێ جدی وەربگرم.

## ٣٤٨- گۆڵدا میر

ئەوەندە لەخۆ بووردوو مەبە، ئەوەندەش گەورە نیت.

## ٣٤٩-ئۆسکار وایلد

عاشق بەخۆبوون دەسپێکی ڕوداوێکی عاشقانەی هەتا هەتاییە.

## ٣٥٠- ڕۆبەرت بنچلی

(تەلگراف لەکاتی هاتنی بۆ ونیز)

شەقامەکان لافاوی یە، تکایە ڕینمایەك.

## ٣٥١- نویل کۆوارد

تەلەگرافی نویل کۆوارد بۆ هاوکارەکەی" جاك ویلسۆن" لە نیۆیۆرك لەکاتی زیاتر بوونی ئەگەری جەنگ.

هەلومەرج نالەبار، تاچەند هەفتەیەك یا چەن ڕۆژێکی تر ئەگەری جەنگ، لەو کاتەدا شانۆکان یەکسەر دادەخرێن، هەموو ئێمە ڕەنگە لەناوبچین.

## ٣٥٢- بیاتریس لیلی

( بەرێوەبەری نووسینگەی زەوی لەبەرمۆدا بەخاتوولیلی ڕاگەیاند کەخانوویەك کەئەو مەبەستێتی. خزمەتکارێك و سکرتێرێك و شوفێرێکی هەیە).

تکایە وێنەی شوفێرەکە بە پۆستی هەوایی.

## ٣٥٣- جیمس مەك نیل ویسلەر

( تەلەگرافی عوزرخواهی لە ئۆسکار وایلد بەهۆی نەگەیشتنی بەئاهەنگی ژنهێنانی ئەو)

ڕەنگە لەکاتی دیاریکراودا نەگەم بەئاهەنگەکەت، دەست بەکاریە.

## ٣٥٤- S.T ئیلیوت

تەلەفزیۆن ئامرازێکە کە لە ڕێگەیەوە میلونەها کەس لە خەڵکی دەتوانن بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ گوێ لە قەسەیەکی نەستەق بگرن و لەگەڵیدا بەتەنهایی بمێننەوە.

## ٣٥٥- فرانك لۆید رایت

تەلەفزیۆن بنێشتی چاوە.

## ٣٥٦- فریدا هەنری

راسپاردە دەکەم، پێش ئەوەی بڕیاربدەی لەسەرخۆ خانەنشین کردن. بەڕاستی هەفتەیەك لەماڵ بمێنەوە و بەرنامەکانی ڕۆژانەی تەلەفزیۆن تەماشا بکە.

## ٣٥٧- گرترود ستین

تاتۆ دەگەیت بەوێ، ئەوێ چیتر ئەوێ نی یە.

## ٣٥٨- پەندی جولەکە

سەخترین کار بێکاری یە.

## ٣٥٩- پەندی جولەکە

ئەگەر دەتەوێ بەدوای ئیزرائیل دا بنێری چی کەسێ باشترە لەپیاوی تەمەڵ.

## ٣٦٠- باسیل بۆسرۆید

بزەی لێوی ئەو وەکو شیلەی گەرمی شیر و هێلکەی مریشك سەرتاپا شتینیەوە.

## ٣٦١- جۆن فیلپوت کۆران

( لەوەسفکردنی خەندەی لێوی " رۆبەرت پیلس")

خەندەی لێوی رۆبەرت پیلس وەکو تابلۆی بەنرخی سەرتابوت دەمێنێتەوە

## ٣٦٢- نانسی ئەستۆر

نانسی ئەستۆر: ئەگەر من هاوسەری تۆ ببوایەم ژەهرم دەکردە ناوقاوەکەتان.

وینستۆن چەرچڵ: منیش ئەگەر هاوسەری تۆ ببوایەم دەمخوارد.

## ٣٦٣- سیدنی جیمس

( دەربارەی ولیام هیویل. مامۆستای کۆلێژی ترینیتی کامبرج)

زانست خاڵی بەهێزی ئەوەوبێ زانستی خاڵی لاوازی ئەو.

## ٣٦٤- ئەلکساندەر پۆپ

( دەربارەی لۆرد هاروی)

ڕوخسارێکی فریشتە ئاسا و باقی جەستەی جانەوەرێکی زیانبەخشە.

## ٣٦٥- ئەلکساندەر پۆپ

مێشکێکی چون پڕ لەکاو دڵێکی وەك ئاسن.

## ٣٦٦- لیندۆن بینزجۆنسۆن( سەرۆکی ئەمریکا )

جیراڵدفۆرد لەو بێزمانانەیە کە ناتوانێت بتڕێ و هەروەها بنێشت بجوێت.

## ٣٦٧- سام گوڵدوین

ئەم حەرامزادەیە چیتر ڕێگەی مەدە بێتە ژوورەکەمەوە. مەگەر کاتێك کە پێویستم بەوبێت.

## ٣٦٨- ئۆسکار لیڤانت

هەر ساتێکی نەدیتنی بەدەستکەوتی دەزانم.

## ٣٦٩- جۆن ویلکس ( لەوانەیە هەڵبەستراوبێ )

کنت ساندەویچ: سوێند بەگیانی خۆم. ئەی ویلکس. دەرەنجام تێنەگەیشتم تۆ بەهەڵواسین بەدار دەمری یان بەنەخۆشی جنسی.

ویلکس : هەتا چی پێش بێت سەروەرم.تایبەت بەوەیە کە من یەکەمجار گرفتاری یاسای جەنابتان دەبم یان گرفتاری عاشقەکانی ئەو.

## ٣٧٠- جۆزیف هیلەر

کەم مایەیی بۆ هەندێ لەدایك بۆماوەیە و بۆ هەندێ دەستکەوت وبۆ هەندێ لەئەستۆخستن. ئەم پیاوە شایستەی هەر سێ جۆرەکەیە.

## ٣٧١- سام هوستون

( دەربارەی تۆماس جیفەرسۆن)

ئەم پیاوە یەك سەگی تەواو مانایە.بەدەر لەوەفاداری یەکەی.

## ٣٧٢- جیمس ئیگیت

شانۆنامەکانی جۆرج برناردشۆ بەهایەکە،کە دەبێ لەپێناوپێشەکیەکانی بیدەین.

## ٣٧٣- برندان بیهان

( کاتێك دوای نیشاندانی ( بارمتە) لەبرندان بیهانیان پرسی : پەیامی شانۆنامەکەت چی بوو؟. لەوەڵامدا ووتی : پەیام؟. پەیام ئیتر چی قسەیەکە؟ پێت وا نەبێ پۆستە چیم.

## ٣٧٤- سامۆئیل جۆنسۆن

بەڵێ، بایەخی دیتنی هەیە بەڵام بایەخی ڕۆیشتن و بینین نە.

## ٣٧٥- جۆرج برناردشۆ

تۆکەچاوەڕوان نیت من دەربارەی شانۆنامەیەك ڕای خۆم بڵێم کە نوسەرەکەی ناناسم. چاوەڕوانیت ؟.

## ٣٧٦- ولیام شکسپیر

کۆمیدی زۆردڵتەزێن و مەرگێکی زۆر بەئازاری پیراموٚس وتیزبی.

## ٣٧٧- ئەریك مۆرکاب وئەرنی ویز

ئەریك : هەرگیز یەکەم ووشەم لەشانۆدا لەبیر ناکەم.

ئەرنی: یەکەم ووشەت چی بوو؟

ئەریك: لێرەوە تکایە ! بەرنامە !.

## ٣٧٨- ئۆسکار وایلد

( دوای دەسپێکی نمایشکردنی بارۆشەی خاتووویندەرمیر)

شانۆنامەکە سەرکەوتوو بوو،بەڵام تەماشاچیان سەرکەوتوو نەبوون.

## ٣٧٩- وودی ئالن

بەهۆکاری ئابوریش بێت،سامان لەهەژاری باشترە.

## ٣٨٠- لۆگان پیرساڵ سمیس

بەوەی کە مرۆڤ بیر بکاتەوە( بەوشێوەیەی کە هەموومان بیر دەکەینەوە) مرۆڤ دەتوانێت لەهەمان کاتی دەوڵەمەندی وەکو دەوڵەمەندەکان ڕەفتار بکات. وەکو ئەوەیە کە کەسێك بەیانی هەتا ئێوارە عەرەق بخواتەوە و دوبارە بەتەواوی ئاگای لەخۆ بێت.

## ٣٨١- مۆریس بارینگ

ئەگەر دەتەوێ ڕای پەروەردگار لەبارەی سەروەت وسامان بزانی.ئەوەندە بەسە کە سەرنجێکی ئەوکەسانە بدەی کە پەروەردگار دەوڵەمەندی کردوون.

## ٣٨٢- هسکت پیرسۆن

لەدونیادا هیچ ئارەزوویەك بەتاسەتر نیە لەئارەزووی دەوڵەمەندەکان بۆ هەبوونی پلەو پایە. مەگەر ئارەزووی پلەو پایەدارەکان بۆ هەبوونی سامان

## ٣٨٣- سۆفی توکەر

من هەم دەوڵەمەندم بووم هەم هەژار. دەوڵەمەندی باشترە.

## ٣٨٤- سامۆیل جۆنسۆن

باشترە بژی بەدەوڵەمەندی تا بەدەوڵەمەندی بمری.

## ٣٨٥- پیتەر دی ڤریس

نە. دەوڵەمەندەکان وەکو ئێمە نین، ئەوان باجی کەمتر دەدەن.

## ٣٨٦- جۆرج برناردشۆ

میندۆزا: من ڕێکرم. بەتاڵانکردنی دەوڵەمەندەکان دەژیم.

تینەر: منیش ڕەسەن زادەم. بەتاڵانکردنی هەژارەکان دەژیم.

## ٣٨٧- جۆرج برناردشۆ

من ملیونێرم. مەزهەبی من ئەوەیە.

## ٣٨٨- C.W. فیلدز

دەوڵەمەند کەسێك نیە جگە لەپیسکەیەکی پارەدار.

## ٣٨٩- پیتەریۆستینۆف

هەندێ جار ئارەزووم دەکرد ئەم پیاوە بیزانیانە کە هەژارونەدارە. نەک ئەوکەسە مێشکماندووکەرە واتە دەوڵەمەندی بێ پارە.

## ٣٩٠- نیل سیمۆن

جاسوسی یەکەم: کاتێك دەگەیت بەوێ کەسێك دەبینی کە جلی بارانی ڕەشی پۆشیوە.

ئەو پرسیاری ئەڵماسەکانت لێ دەکات.

جاسوسی دووەم: منیش ئەڵماسەکانی پێ دەدەم؟.

جاسوسی یەکەم: نەخێر، کاری واناکەیت،ئەو سۆراخی ئەڵماسەکان لەهەمووان دەکات. پاشان تۆکەسێکی شیکی موشەرابی دەبینی. ئەڵماسەکانی پی بدە.

جاسوی دووەم: ئەو کێ یە ؟.

جاسوسی یەکەم: خۆمم.

جاسوسی دووەم : ئێ !. کەواتە ڕوخسارت دەگۆڕی؟.

جاسوسی یەکەم: نەخێر! . هەر ئێستا ڕوخسارم گۆڕیوە.

## ٣٩١- ئەرستۆ

ئەوەی توانای پێکەوە ژیانی نیە لەگەڵ کۆمەڵگەدا و یان بەهۆی خۆپەسەندیەوە پێویستی بەوە نی یە یان جانەوەرە یان خودا.

## ٣٩٢- ئالان بینت

ئێمە هەستاوین بەدروستکردنی کۆمەڵگایەکی ئانارشیستی( پشێوی خوازنە).بەڵام بەداخەوە خەڵکی یاساکانی پەیڕەو ناکەن.

## ٣٩٣- ساكى

لەم رۆژانە هەموو كەسانى ئابڕومەند لەسەروى توانای خۆیانەوە دەژین وهەموو بێ دەست وپێکان لەسەروی توانای کەسانی تر.

## ٣٩٤- سۆمەرست موهام

بۆنەکانی تاك وكۆمەڵ وەکو یاری ماشینی قومارە، کۆمەڵگە بانکدارە،تاکەکان هەندێ جار دەیبەنەوە وهەندێ جاریش دەدۆڕێنن، بەلأم براوەی هەمیشەیی بانکدارە.

## ٣٩٥- ئیدوارد ڕیس

شاری بچووك : جێگەیەك كە تیادا شوێنێك نیە كە نابێت بۆی بچیت.

## ٣٩٦- ساكى

ناونیشانی ( ئەدەرس) بۆ ئەوەیە كە بتوانین حەشارگەی خۆمان پەنهان بهێڵینەوە.

## ٣٩٧- نویل كۆوارد

نازانم دوا دەرەنجام وچارەنووسی لەندەن بەکوێ دەگات، چەندێ تەلارەکانی بەرزتر دەبێتەوە رەفتاری خەڵکەکەی دادەبەزێت.

## ٣٩٨- ئۆلیڤەر سنت جۆن گۆگارتی

( کاتێك پێشنیار کرا درەختەکانی کەنارەکانی ( لیفی) ببڕنەوە ئەوەش لەبەر ئەوەی ئەوێ شوێنی کاروکاسبی ڕووسپیەکانە)
خەڵکی لەحەقی درەختەکان تاوان دەکەن ئەوکاتەی تۆڵە لەدرەختە بێچارەکان دەکەنەوە.

## ٣٩٩- ئۆليڤەرسنت جۆن گۆگارتی

لەندەن زانكۆيەكە پسپۆری دە مليۆن فێركردنی ديوە. ئەوەش ئەوەيە كە بژين ولێگەرێين كەسانی تريش بژی.

## ٤٠٠-.H.D. لارنس

سيدنی هەموو لەندەن بوو بێ ئەوەی لەندەن بێ. بەبێ هيچ جادوييەكی ..رفێن كەلەندەن وەبەربهێنێت. ئەم لەندەنەی كە باشووری نيوەی جيهان هەمووی بوو،هەروەك ئەوەی كە بە پێنچ خولەك،لەجياتی ئەوەی رۆنی رووەك لەبری كەرە دروستكرابێت.

## ٤٠١- نەناسراو

پەروەردگار دوورگەی دروست كرد وكارێكی باشی كرد، بەڵام نەفرەت لە شەيتان كەسيدنی دروست كرد.

## ٤٠٢- بەرتۆڵد برچت

دزينی بانك بەبەراوورد لەگەڵ دامەزراندنەكەی شتێك نی يە.

## ٤٠٣- لۆرد دارلينگ

( زيندانەيەك بەنارازی بوون لەوەی لەدانيشتنی دادگای دادوەری دارلينگ بە دزێكی پيشەيی ناونراوە).

زيندانی : ئێمە هەموو دووبابەتی دزيمان هەبوو، جەنابی دادوەر، لەهەردوو بابەتەكە دەستگيركرام.

لۆرد دارلينگ: كەسێكيش ڕای نەگەياندووە كە تۆ لەكارەكەت سەركەوتوو بويت؟.

## ٤٠٤- ئۆلیڤەر نۆرس

من بڕوام بە خودا و پارێزەرێکی باشە.

## ٤٠٥- بنجامین دیزریلی

"هۆگۆ بۆ هۆن ووتی :" ئادەمیزادی پەسەند بەلای منەوە کەسێکە کە بیروڕای منی لاپەسند بێت."

## ٤٠٦- نەناسراو

دان بەخۆتدا بگرە ولەبری قاڵەقاڵ لەگەڵ کەسێکی تورە بەنەرمی وەڵامی بدەرەوە چونکە ئەمە فەرمانی کتێبی پیرۆزە. لەمە بەدەر. بەم کارە لەهەموو شتێك زیاتر ڕقی لایەنی دووەم هەڵدەسێنی.

## ٤٠٧- جیلی کوپەر

کۆبونەوەی ئیداری وەکو کۆکتێلێکی میوانداری یە کە هەم ئارەزووی ڕۆیشتنیت نیە و هەمیش ئەگەر بانگهێشتت نەکەن دڵگران دەبیت.

## ٤٠٨- برۆکس ئاتکینسۆن

دوای هەر جەنگێك دیموکراسیەکی کەمتر بەجێ دەمێنێت.

## ٤٠٩- جۆرج ئۆرول

خێراترین ڕێگەی کۆتایی هێنان بەجەنگ شکست خواردنە.

## ٤١٠- ڕۆبەرت بایرون

( بەهەست کردن بەمەترسی دەسەڵات گرتنە دەستی نازیەکان)

لەسەر پاسپۆرتەکەم ناونیشانی شەڕخواز دەنووسم.

## ٤١١- جروم ڕاگنی وجیمس ڕادۆ

( دەربارەی جەنگی ڤێتنام)

خزمەتی سەربازی کەسپی پێستەکان، ڕەش پێستەکان دەنێرنە شەڕی زەرد پێستەکان تا لەو ڕێگەیەوە خزمەتی وڵاتێك بکەن کە خودی سپی پێستەکان لەسوورپێستەکانیان دزیوە.

## ٤١٢- ئارسەر شلزینگەر

هەموو جەنگەکان لەسی ڕۆژی یەکەمدا لایەنگرانی زۆر دەبێ.

## ٤١٣- جۆرج کلیمانسۆ

شەڕکردن ئاسانترە لە ئاشتی کردن.

## ٤١٤- جۆن.F.کەنەدی

مرۆڤ دەبێ مەسەلەی جەنگ یەکلایی بکاتەوە.گەرنەجەنگ ئەو یەکلایی دەکاتەوە.

## ٤١٥- ئیمیراڵد کۆنارد

( لەکاتی بۆمب بارانی لەندەن)

لەگەڵ تەلەفونەکە وشکسپیر لەژێرمێزەکە بووم.

## ٤١٦- فران لا بوویتس

یەکەم هەنگاو بەرەوسەرکەوتن لەجەنگدا وەها کارێکە خەڵك واز لەشەڕکردن بێنن.

## ٤١٧- میرابۆ

جەنگ پیشەسازیەکی خۆماڵی پروسیایە (ئەڵمانیا).

## ٤١٨- هیربەرت هۆڤەر

( سی ویەکەمین سەرۆك کۆماری ئەمریکا)

هەڵگیرسانی جەنگ لەلای گەورەکان وباساڵاچووانە وشەڕکردن وکوشتنیش لەناولاوەکان.

## ٤١٩- سیریل سکۆت

ژیانی نەداری وەکو سورێژەیەکە دەبێ لەلاوێتیدا بەسەرت برد بێ.

## ٤٢٠- لۆگان پیرساڵ سیمس

کام ئاواز شادی بەخشترە لەدەنگی لاوان ئەوکاتەی کەنابیستیت چی دەڵێن؟.

## ٤٢١-- مارك توین

ژیان بێ ئەندازە خۆشتر دەگوزەرا ئەگەر لەهەشتا ساڵیدا بێینە دونیاوە و بەئارامی بەهەژدەساڵی دەگەیشتین.

## ٤٢٢- جۆرج برناردشۆ

کارێك کە لاوان دەتوانن بۆ پیرەکان ئەنجامی بدەن ئەوەیە کە تەکانیان پێ بدەن تا پێ بەپێ ی ڕۆژگار بجولێن.

## ٤٢٣- ولیام فیتەر

پیاوێکی پەنجا ساڵە لەچاوی کچێکی بیست ساڵە ئەوەندە گەنجە وەك بابا نوئیل !.

## ٤٢٤- نێردراو: S میلەر

لاوێ : پەنجا ساڵی سەرەتای ژیانی خۆتان وبیست ساڵی سەرەتای ژیانی ئەوانی تر.

## ٤٢٥- ئۆسکار وایلد

بۆ گەڕانەوەی لاوێتیم هەرکارێك بلێی دەیکەم. جگە لە وەرزشکردن. سبەی زوو لەخەوو هەستان و ئەندامێکی سوودبەخش بۆ کۆمەڵگە.

**٤٢٦- وابەستەبە: J.A ئایر**

ئەگەر ئەوەندە هۆشیار نەبوومایە کارێکی سادەترم هەڵدەبژارد وەکو بڵاوکردنەوە سادەترین کارێك کە بەمێشکمدا دەهات هەر ئەمەیە.

**٤٢٧- سامونیل بوتلەر**

من لەچاپکارانم ئەوەندە شتم دیوە کە ئێستا تێبگەم کە کۆمەڵەی بڵاوکردنەوە و چاپ کردن شتێك لەئەدبیات نازانن.جگە لەوەی بەتوندی وبەسەختی بەوباوەڕە گەیشتون کە لەڕووی کاسبی کردن بەوەوە دەکرێ بەشتێ بگەیت.

**٤٢٨- M.J باری**

بارودۆخەکە لەگەڵ سەردەمێك کە نووسەرێك بەهۆی کوشتنی چاپ کەرەوە. لەسێدارە درا جیاوازە. دەڵێن کاتی نووسەرێك لەسەر سەکۆی لەسێدارەدان وەستا بوو لەگەڵ قەشەو هەواڵنێران خواحافیزی کرد. لەو کاتەدا چاوی کەوت بە چەند چاپ کارێك کەلەخوارەوە لەڕیزی یەکەم وەستا بوون. لەگەڵ ئەواندا خواحافیزی نەکرد. لەبری ئەوە وتی :" بەئومێدی دیدار ".

**٤٢٩- J.S. پەرلەمان**

نووسەران لەدیدی بڵاوکارانەوە کەسانێکی خۆپەسندو بێ بایەخ وسادەوبێ هەوسەڵەن. لەبەر ئەوە بێ سوودە گەر بتەوێ لەدەرگای عەقڵ و لۆژیکەوە لەگەڵیان قسەبکەیت یان بۆیان بسەلمێنی کە ئێوەی نووسەر بۆ خۆتان

عیزەت و رێزێکتان هەیە و تەنها چاوەڕوانیەك کەلەوان دەیکەیت خستنە ڕووی کتێبە کەتانەو بەهیچ پێوەرێکی بازرگانی توانای ئەنجامدانی ئەوەیان نی یە.

## ٤٣٠- مایکل جۆزیف

لەگەڵ کۆمەڵەی نووسەران ناتوانیت یان بەلای کەمەوە نابێ کێشمەکێشیان لەگەڵ بکەیت.زۆربەیان وەکو منداڵن کە زوو فرمێسکەکانیان دەگۆڕێت بە بزە پێکەنین. بەڵام دەبێ ڕێگاکەی بزانی.

## ٤٣١- تۆماس کامبڵ

" تۆماس کامبڵ لەمیواندارییەکی ئەدەبیدا پەرداخەکەی بەسەلامەتی ناپلیۆن بەرزکردەوەو ڕوونی کردەوەو وتی: "

هەڵە نەکەن بەرێزان. من قبوڵمە کە ئیمپراتۆری فەرەنسا دیکتاتۆرە. قبوڵمە کە دێوە و پەسەندەمە کە ئەو دوژمنی سوێندخواردووی میللەت و هەروەها هەموو ڕەگەزی مرۆڤە. بەڵام بەرێزان.وەرن لەحەقی دوژمنی گەورەمان دادگەر بین. بیرمان نەچێت کە ناپلیۆن یەك جار کتێب فرۆشێکی بەتیر پێکاوە.

## ٤٣٢- گراهام گرین

( دوای ئەوەی بڵاوکەرەوەی ئەمریکایی " گراهام گرین" لەبارەی کتێبی " سەفەرەکانی من ومامەم" ئەم پەیامەی نارد:" بەرزە بەڵام ناونیشانی کتێبەکە دەبێ بگۆڕدرێت:".

پێویست ناکات ناونیشانی کتێبەکە بگۆڕیت. گۆرینی بڵاوکەرەوەکە ئاسانترە.

## ٤٣٣- ئۆسكار وایلد

بەگومانی من بڵاوکەرەوەی بەکۆمەڵ جێگەی بڕوانین.بەڕوخساریان دیارە.

## ٤٣٤- G.P وود هاوس

کاری بڵاوکەرەوە ئەوەیە جارجار چەکێك وازۆ بکات. جگە لەوە کارە سەرەکیەکان کۆمەڵێك کەسی شیاوی دەوروبەری ئەنجامی دەدەن.

## ٤٣٥- .M.G.یانگ

کتێب چاپکردن لەبڵاوکەرەوەی زانکۆی ئۆکسئۆرد وەکو هاوسەرگیری یە لەگەڵ کچاندا کە زیاتر شانازی کردنی لەگەڵدایە تا چێژ وەرگرتن.

## ٤٣٦- ڕۆبەرت لویس ستڤینسۆن

بیرکردنەوەی من بۆ لەبیرکردنی شەڕە.

## ٤٣٧- ئەریك مروکام وئەرنی وایز

ئەریك : خێزانەکەم بیرو هۆشی ڕیسواییە.

ئەرنی: بەڕاستە؟.

ئەریك : بەڵێ. بەگیانی تۆ. مەحاڵە شتێك فەرامۆش بکات.

## ٤٣٨- جۆرج برناردشۆ

هەر پیشەیەك پیلانێکە لەدژی ئەوکەسانەی کە پیشەوەر نین.

## ٤٣٩- جۆن کلیس.گراهام چاپمەن، تری جۆنس، مایکڵ پالین وئەریك ئیدڵ

ئەو هەواڵەی سەبارەت بە ئێوە لێرە نیشانی دەدا کە تۆ کەسێکی زۆر ماندوو کەریت پسپۆڕانی ئێمە باس لەتۆ دەکەن وەکو کەسێکی زۆر دەبەنگ. بێ بیرکردنەوە.ترسنۆك، بێ غیرەت، لاسایی کەرەوە. غەمناوەرو

بێ لەزەت و بەشێوەیەکی بێ چارەسەر ووشك و ڕووگرژی. هەرچەند ئەم تایبەتمەیانە بۆ زۆر لەکارەکان بەخاڵی لاواز دەژمێردرێت. لەکاری ژمێریاریدا بەنایاب دەژمێردرێت.

**٤٤٠- ڕۆبەرت.H.جەکسۆن**

هەرکاتێك لەکورسی دادوەری پرسیارێك دێتە بەرگوێ خۆشحاڵ دەبم، چونکە ئەمە خۆی بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوەی دادوەر هۆشیارە.

**٤٤١- ولیام شکسپیر**

وەرن پێش هەموو شتێك پارێزەران لەناوبەرین.

**٤٤٢-وابەستەبە : ڕۆبەرت فرۆست**

دەستەی دادوەران دوازدە کەسن و بۆ ئەوە هەڵدەبژێردرێن تا دەست نیشانی بکەن چی کەسێك پارێزەرەکەی باشترە.

**٤٤٣- ڕۆی.M. کوهن**

من نامەوێ بزانم یاسا چی یە. دەمەوێ بزانم دادوەر کێ یە.

**٤٤٤- فران لبوویتس**

ئەگەر دەتەوێ لەژیانتدا پێش بکەوی پارێزدرێکی باش بدۆزەرەوە. نەك کتێبێکی باش!.

**٤٤٥- L.H.مینکن**

دادگا شوێنێکە کە تیایدا عیسای مەسیح و یەهودای ئەسکەریوت شان بەشانی یەکترن وشانسی بردنەوە بۆ یەهودایە.

**٤٤٦- مولیر**

لێرە( لەپاریس) سەرەتا مرۆڤ بەدار هەڵدەواسن پاشان دادگایی دەکرێت.

## ٤٤٧- ئەرستۆ

ئەفلاتون بەلامەوە ئازیزە،بەڵام ڕاستی لەئەفلاتون ئازیز ترە.

## ٤٤٨- ڕۆبەرت لویس ستیڤنسۆن

بێ ڕەحمانە ترین درۆکان زۆربەیان لەبێدەنگیدا دەوترێت.

## ٤٤٩- ڕالف والدۆ ئیمێرسۆن

هەرچەندێ ئەو بەدەنگێکی بەرز تر لەشانازی خۆیەوە هاواری دەکرد. ئێمە خێراتر کەوچکەکانمان دەژمارد.

## ٤٥٠- جۆرج براك

ڕاستی خۆی هەیە.درۆ دروست دەکرێت.

## ٤٥١- نێردراو: C.S.بریتڵ

لەم دونیا دوودەستە کەسان هەن: کەسانێك کەلەسەر حەقن و کەسانێك کە ناحەقن. لەم نێوەندەدا ئەو کەسانەی لەسەر حەقن دەستنیشانی دەکەن چی کەسانێك لەسەر حەق نین.

## ٤٥٢- هاری.S. ترومان

( دەربارەی ریچارد نیکسون)

پێمان وانی یە ئەم حەرامزادە جیاوازی نێوان ڕاستی و درۆ تێبگات.

## ٤٥٣- ڤیراجۆنسۆن

لەهەموو شتێکدا لایەنی میانڕەوی بپارێزە،تەنانەت لەدەربڕینی ڕاستیشدا.

## ٤٥٤- جبران خلیل جبران

زیادەڕوی ڕاستی یەکە زۆر تورە.

## ٤٥٥- جروم K. جروم

هیچ شتێك لەڕاستگۆیی باشتر نی یە. مەگەر ئەوەی درۆزنێكی لێهاتوو بیت

## ٤٥٦- وابەستەبە : بنجامین دیزریلی

درۆ سێ جۆرە: درۆ : درۆی شاخدار و ئامار.

## ٤٥٧- سوقرات

بەڵام ئەی " ئاگاسۆنی" ئازیز، بزانە كە دژایەتی كردنی سوقرات بەهیچ شێوەیەك گرفت نی یە. ئەوەی دژایەتی ناناسێ ڕاستی یە.

## ٤٥٨- ئەلجرنون سیدنی

پیاوی درۆزن دەبێ بیر كردنەوەیەكی باشی هەبێت.

## ٤٥٩- جۆرج برناردشۆ

هەموو ڕاستیەكی گەورە لەدەست پێكردنی بەتۆمەت لە پیرۆزیەكان لێكدەدرێتەوە.

## ٤٦٠- پەندی جولەكە

نیوەی ڕاستی درۆیەكی تەواوە.

## ٤٦١- جۆن پنت لاند مەهافی

هەرگیز ڕوداوێك بەمەبەستی ڕاستبوونی باس مەكە. ئەگەر ڕووداوێكی سەرنج ڕاكێش بوو بیگەیەنە.

## ٤٦٢- بیت میدلەر

هیچ كاتێك نازانم لەو قسانەی كە دەیكەم چەندێكی ڕاستە.

## ٤٦٣- ئۆسكار وایلد

كاتێك راستی دەڵێی،دەبێ دڵنیابیت كە درەنگ یان زوو دەبیتە داهێنەر.

## ٤٦٤- ئۆسكار وايلد

ڕاستی بەدەگمەن بێگەردە وهیچ کاتێکیش سادە نی یە. ئەگەر یەکێك لەم دووە بێت ژیانی ئەمڕۆیی زۆر ماندووکەرونەدەبیاتی ئەمڕۆیی بەڕاستی نەدەبوو.

## ٤٦٥- ریچارد ویلبەر

کامێشی جیهان دەدۆشین و لەهەمان کاتدا لەبن گوییدا دەڵێین :" تۆبوونت نی یە".

## ٤٦٦- دیان ئاچسۆن

یەکەم مەرج بۆ بوونە خاوەن دەوڵەت دەبەنگ بوونە.

## ٤٦٧- کۆنت ئەکسنس تیرنا

مەگەر نازانی کورم. کەدونیا بەچ تۆزقاڵێك سەرمایەی دانایی بەڕێوەدەبرێت؟

## ٤٦٨- F.I ستۆن

حکومەتەکان هەموویان بەدەستی درۆزنەکانەوەن.واتا نابێ بەووتارەکانیان ئومێد ببەستین.

## ٤٦٩- ئیدوارد ئیڤەرت هاڵ( ڕوحانیەکی ئەمریکی )

– دکتۆر هیلّ، ئایا بۆسیناتۆرەکان دوعا دەکەیت؟.

– نەخێر لەگەڵ ئەو سیناتۆرانەی کەمن دەیانبینم، بۆ وڵات دوعا دەکەم.

## ٤٧٠- هەنری وارد بیچەر

لێبگەڕێین لەپشێوی ( فەوزا). خراپترین شتی دونیا حکومەتە.

### ٤٧١- چارلز دیگل

چۆن دەکریٚ لەولآتێکدا حکومەت بەرێوەببرێت کە(٢٤٦) جۆر پەنیری هەی؟.

### ٤٧٢- .H.C.سیسۆن

لێرەکارمەندی دەوڵەت نووستوە.کەسێك کە خزمەتی دەکرد ولەخزمەتی شەیتان بوو.

### ٤٧٣- جۆرج برناردشۆ

ئەوحکومەتەی کە گیرفانی پیتەر دەبڕێت ودەیخاتە گیرفانی پاول،هەمیشە دەتوانێت بەپاولٚ پشتی قایم بێت.

### ٤٧٤- هارۆڵد مەك میلان

دوای تەمەنێك ئێستا بەو دەرەنجامەگەیشتم کە دەستەی دامەزرێنەران. هەرجارێك یەکدەگرن هەڵە دەکەن.

### ٤٧٥- ڤۆلتێر

حکومەتەکان هەم پێویستیان بەشوانە و هەم بەقەساب.

### ٤٧٦- نێردراو: .H.W بۆرن

هەندیٚ کەسان هیچ شتێکیان پیٚ نی یە بەلآم بۆتێگەیشتنی ئەو باسە دەبێت ماوەیەکی زۆر گویٚ لەقسەکانیان بگریت.

### ٤٧٧- ویل ڕۆجەرس

هەموو مرۆڤەکان گێلن. لەکۆتایی هەر کەسەولەشتێکی جیاوازدا نەزانن.

### ٤٧٨- مەدام دی سیڤگن

هەرچی زیاتر پیاوان دەناسم،قەدری سەگەکان زیاتر دەکرم.

## ٤٧٩- تۆماس فولەر

گوێ درێژ ئەگەر بەسەفەریش بڕوات کاتێ دەگەڕێتەوە هەر گوێ درێژە نەك ئەسپ.

## ٤٨٠- نەناسراو( فەرەنسی )

چی ئاژەڵێکی خراپە ! . کاتێك هێرشی بۆ دەبەی بەرگری لەخۆی دەکات.

## ٤٨١- بیل ڤان

ئومێدەوارم کاتێك مێروولەکان جیهانیان گرت بەحەق بەبیرخۆیان بهێننەوە کەئێمە لەهەموو گەشتەکانمان ئەوانمان لەگەڵ خۆمان دەبرد.

## ٤٨٢- سۆتاونسند

بەئومێدی ئەوەی ژیانم لەلاخۆشبێت بڕیارم دا بیرەوەریەکانم بنووسم. بەڵکو ژیانم لەسەر خامە باشتر بێتە بەرچاو.

## ٤٨٣- .J.P. ئۆرۆرك

شێواز و ڕەوشی پەروەردەکردنی منداڵ هەموو کەس دەیزانێ جگە لە کەسانی منداڵدار.

## ٤٨٤- ئۆسکار وایلد

دوای خواردنی نانێکی باش ئینسان دەتوانێت لەهەڵەی هەموو کەسێك ببورێت، تەنانەت لەهەڵەی خزم و کەسوکاری.

## ٤٨٥- .J.P. ئۆرۆرك

ماڵداری بەئەندازەی کارکردن لەکارگەی خەڵوز پیس ونەشیاوە، بەڵام دەرامەدی کەمترە.

## ٤٨٦- جیمس تۆد

مێرد بەتوڕەییەوە بەژنەکەی : ئەم گەردوخاکەی سەرمێزەکەت چی لێکرد؟. من ژمارە تەلەفونێکم لەسەر نووسیبوو!.

## ٤٨٧- فیلیس دیلەر

پاککردنەوەی ماڵ لەپێش گەورەبوونی منداڵەکان وەکو پاککردنەوەی ڕێگایە پێش ئەوەی بەفر بیبەستێت.

## ٤٨٨- جۆن ڕیڤەرس

لەماڵداری بێزارم !. دێیت تەختی خەوەکان چاك دەکەیت، قاپەکان دەشۆیت، ئینجا لەوکاتەدا شەش مانگ دوای ئەوە دوبارە دەبێ هەموو ئەم کارانە سەر لەنوێ دەست پێ بکەیتەوە.

## ٤٨٩- جۆرج برناردشۆ

گەورەترین ئیمتیازی ئوتێل ئەوەیە کە ئینسان دەتوانێت لەژیانی هاوسەریدا پەنا بۆ ئەوێ ببات.

## ٤٩٠- خاتوو پاتریك کامبل

دەڵێن کلینسی ئاو دەستەکەی ماڵەوە تەواو بووە.ئێستا چی چاوەڕوانیەك لە من دەکەیت هەم لە بیری کلینسی تەوالێتەکە بم و هەمیش ڕۆڵی ڕۆمانتیك ببینم؟.

## ٤٩١- J.P. ئۆرۆرك

جەنگی کەنداو یەکەمین جەنگە کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەتەلەفزیۆن پەخش دەکرێت. لەمەبەدەر یەکەمین جەنگە کە ڕۆژنامەنووسان هەواڵەکانی لەباری هۆشیاریدا بڵاودەکەنەوە.

## ٤٩٢- ئەدۆلف.S. ئۆکس

کاتێك ڕۆژنامەکانی تر باسی تاوانێکی سێکسی بڵاودەکەنەوە ناوی لێ دەنێن وروژێنەری سێکسی،بەڵام ئەگەر هەر ئەو بابەتە ڕۆژنامەی نیۆیۆرك تایمز بڵاوی بکاتەوە ناوی دەنێن لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسی !.

## ٤٩٣- جۆن.B.بۆگارت

ئەوەی کە سەگێك گازی لە کەسێك گرتبێ. هەواڵ نیە چونکە ئەم ڕووداوانە زۆر ڕوودەدەن. بەڵام ئەگەر مرۆڤێك گازی لەسەگ گرت. ئەمە هەواڵە.

## ٤٩٤- B.J. پرستلی

زیاتر شێوەی بەکەسێکی بەڕێز دەکات تا ڕۆژنامەنوسێك.

## ٤٩٥- مارك توین

بۆ پاراستنی ئازادی ڕۆژنامەکان یاسا دارێژراوە. کەچی بۆ پاراستنی هاوڵاتیان لەبەرامبەر ڕۆژنامەکان کەسێك یاسایەکی بەکەڵکی دانەناوە.

## ٤٩٦- لۆرد تۆماس ئۆف فلیت

بەشێك لەپەیامی کۆمەڵایەتی هەر ڕۆژنامەیەکی گەورە ئەوەیە کە بۆ دەستەیەك لە کەسانی مووچە خۆر شوێنی خەوتن و نیشتەجێ بوون دابین بکات.

## ٤٩٧- کلاود کۆکبۆرن

(کلاوکوکبۆرن ووتبوی کە بەهۆی ئەم هەواڵەی ژێرەوە خەڵاتی یەکەمی ساردترین ناونیشانی لەپێشبرکێ ی ڕۆژنامەی تایمز بۆ خۆی مسۆگەر کردووە:"

ڕوودانی بوومەلەرزەیەکی سووك لەگەڵ زیانی لەچیلی.

## ٤٩٨- ئەلسكاندەر كۆكبۆرن

داوەرانی یەکەم کەھەیە ڕەتبکەنەوە. پاڵپشتییان بکەن.ئەمەیە یاسای سەرەتای ڕۆژنامە نووسی.

## ٤٩٩- یەهودی منوحین

هەرکاتێك ڕۆژنامەیەك دەبینم یادی درەختە بێچارەکانم دەکەوێتەوە کە تا درەختن جوانی وسایەو سێبەریان پێشکەشی ئێمە دەکەن. بەڵام کاتێك دەکرێن بە کاغەزی ڕۆژنامە تەنها دەبن بەزبالە و خاشاك.

## ٥٠٠- هارۆڵد نیکلسۆن

( کاتێك لەلایەن ڕۆژنامەی سەندەی ئێکسپرێسەوە بەتەلەفون لێیان پرسی گەورەترین هیواو ئارەزووت بۆ ساڵی ١٩٥٦ چی یە ! "

گەورەترین ئارەزووم ئەوەیە کە کاتێك سەرقاڵی کارم، لەسەندەی ئێکس پرێسەوە تەلەفونم بۆنەکەن.

## ٥٠١- ئۆسکار وایڵد

_( جیاوازی نێوان ڕۆژنامەکان وئەدەبیات)

ڕۆژنامەکان بۆخوێندنەوە نین وئەدەبیاتیش ناخوێنرێتەوە.

## ٥٠٢- سامۆیل باتلەر

( لەبەرگری کردن لەشەیتان)

بیرمان نەچێت کەئێمە گوێمان لەیەك لای شەڕکەر گرتووە. چونکە نوسراوەئاسمانیەکان خودا ناردویەتیەخوارەوە.

## ٥٠٣- پیتەر بارنیس

کلایر: بەچی دەزانی کە خودای ؟.

ئێرل گۆرنی: ( خۆناو زەد کردن بەخودا).زۆر سادەیە. کاتێك لەگەڵ ئەودا ڕاز ونیاز دەکەم. دەبینم خەریکم لەگەڵ خۆمدا قسەدەکەم.

## ٥٠٤- دانتە گابریل ڕۆستی

ناخۆشترین سات بۆ ئادەمیزادی بێباوەڕ ئەو کاتەیە کە بەڕاستی دەیەوێ سوپاسگوزاری بکات بەڵام نازانێ لەکێ.

## ٥٠٥- تۆماس ژاژ

کاتێك لەگەڵ خودا قسە دەکەیت ناوی ڕازونیازە بەڵام ئەگەر خودا لەگەڵ تۆدا قسەبکات دەڵێن دوچاری ورێنە( ئەسکیزۆفرنی)بووی.

## ٥٠٦- فردریخ کلۆپستۆك

سەردەمێك من وخودا هەردووکمان دەمانزانی مانای چی یە. ئێستا تەنها خودا دەزانێت.

## ٥٠٧- نەناسراو

خودایە. ئەگەر بونت هەیە. ڕوحی من. ئەگەر هەیە، ڕزگاری بکە !.

## ٥٠٨- ئارسەر هیوکلۆف

تۆ دەبێ تەنهاخودایەکت هەبێ.کێ یە کەبتوانێ لایەنگری دوو خودا بێ؟

## ٥٠٩- ساموێل جۆنسۆن

حەقی خانەنیشنی ! پارەیەك کە بەدەرامەتی دەوڵەتی لەبەرامبەر خیانەت بە وولاتەکەی پێی دەدرێت.

## ٥١٠- ڕۆبەرت لویس ستیڤنسۆن

ئەوکەسەی پەلەکردن بچێنێ بەدهەرسکردن دەڕوێنێ.

## ٥١١- پول ئیلوارد

ئێمە لەپلەی جۆراوجۆردا دەکولێین.

## ٥١٢- ڕۆناڵد ڕیگان

لەجەلی خواردنی کەسێك دەکرێ بەزۆر شت لەکەسایەتی ئەودا پەی ببرێت.

## ٥١٣- جۆرج برناردشۆ

چەندێ مرۆڤـ لە زۆرشت دا شەرمەزار بێت زیاتر جێگەی ڕێزە.

## ٥١٤- ولیام شکسپیر

وەکو کورسی دەلاکخانەکانە لەگەڵ هەموو لەش و لارێك دا دەگونجێ.

## ٥١٥- ڕۆبەرت فرۆست

دونیا پڕە لە کەسانی دارێژەر. ژمارەیەك بڕیار دەدەن کاربکەن وژمارەیەکی تریش بڕیار دەدەن لێگەڕێن ئەوان کاربکەن.

## ٥١٦- جۆرج گرۆسمس و ودیون

بێ دەنگ وبەئۆقرە لە ژوورەکە چوومە دەرەوە کە لەبەر دەرگا پێم لەحەسیرەکە گیر بوو.

## ٥١٧- گۆتە

بێ پەلەکردن بەلام بێ حەوانەوە.

## ٥١٨- تۆم ماسۆن

"بەخۆت بە!. ڕەنگە ناشیرین ترین پەندێ بێت کە بەهەندێ کەس دەتوانرێت بوترێت.

## ٥١٩- ولیام مەك فی

جیهان بەکامی کەسێکە کە پڕ جۆش و خرۆش وساردە.

## ٥٢٠- نەناسراو

ئەوکاتێك لەتەواوی ڕێگەکانی تر بێ ئومید دەبوو. هەرگیز لەدۆزینەوەی ڕێگەچارەیەکی گونجاو سەرپێچی نەدەکرد.

## ٥٢١- ئۆسکار وایڵد

بەداخەوە ڕەفتاری ئەو لەو ڕەفتارە لاوازانەیە کە لە هیچ شتێك کاریگەری وەرناگرێ.

## ٥٢٢- ئۆسکار وایڵد

سیسیل گراهام: ڕەشبین چی کەسێکە؟.

لۆرد دار لینگتۆن: ڕەشبین کەسێکە کە نرخی هەرشتێك دەزانێت بەڵام بەهای هەر شتێك نە.

## ٥٢٣- ئالان ئیکبۆرن

بەلای مێروولەوە بیرۆکە هەیە کە خەو تایبەت دەکات بۆ شەو.

وادەردەکەوێ کە ئەمشەو دەتەوێ ئەم تیۆرە پوچەڵ بکەیتەوە.

## ٥٢٤- ماکس بیر بووم

نەگبەتیەکانی سبەینان کەسانێك هەن کەبە پێداگری ولەسەر ڕۆیشتن دەیانەوێ لەسەر مێزی نان خواردن. ئەو خەونانەی کە دیویانە باس بکەن.

## ٥٢٥- مارك توین

نازانم بۆ ئەوکەسانەی پرخە پرخ دەکەن دەنگی پرخە پرخی خۆیان نابیستن.

## ٥٢٦- وودی ئالن

من خولێکی بەدەنگی بەرز خوێندنەوە فێربووم چۆن لەچاوتروکانێکدا یەک لاپەرە بخوێنمەوە. " جەنگ وئاشتی" تۆلستۆی بەو شێوەیە لەماوەی (٢٠) خولەکدا خوێندمەوە. دەربارەی ڕوسیایە.

## ٥٢٧- لۆگان پیرسال سمیس

خەڵکی دەڵێن گرنگتر ژیانە. بەڵام خوێندنەوە بەلەپێشتر دەزانم.

## ٥٢٨- بەرتراند ڕاسل

هۆکاری خوێندنەوەی کتێب دووشتە: یەکێکیان چێژ وەرگرتن. ئەوی تریان شانازی فرۆشتنە.

## ٥٢٩- ئەنتۆنی ئیدن

ئەزموونی چەندین ساڵە فێری کردووم کە کەوتنە بەر ڕەخنە هەمیشە هۆکاری ئەوە نی یە لەسەر هەڵە بیت.

## ٥٣٠- کینت تۆمپسۆن

کاتێك سواری چەرخ و فەلەك بویت چارەیەکت نی یە جگە لە خولانەوە.

## ٥٣١- ئەلینور ڕۆزفلت

تاخۆت حەز نەکەیت هیچ کەسێك ناتوانێت سەرزەنشتتان بکات.

## ٥٣٢- فرانسۆدۆك دی لارۆشفۆکۆ

هەڵە. بچووکەکان دەدرکێنین بۆ ئەوەی خەڵکی باوەڕ بکەن کە هەڵەی گەورەمان نیە.

## ٥٣٣- جین ڕایس

من قالیچەیەکم لەدونیای پۆتینەکان.

٥٢٤- جان كارلايل( هاوسەری تۆماس كارلايل)

من هەرگیز ئەوكەسەی کەمن وتۆبیرمان لێدەکردەوە نیم.

## ٥٢٥- سيريل كانولی

هەموو ئێمە زیندانی کراوین تا هەتایی لەناخی ڕەشی خۆویستنماندا.

## ٥٣٦- ليو گريد

هەموو شانۆکانی من گەورەن. دیارە هەندێکیان لاوازن بەوەشەوە هەموویان گەورەن.

## ٥٣٧- نيكۆلای گوگۆڵ

ئەگەر ڕوخسارت ناتەواوی هەیە خەتای ئاوێنە نی یە.( خۆشكێنی ئاوێنە شكاندن هەڵەیە).

## ٥٣٨- فرانگ.J.گيبلين دووەم

لەگەڵ خۆت بە. مەگەر لەخۆت باشتر شك دەبەیت؟.

## ٥٣٩- فردريك نيچە

هەرگیز باسی خۆ نەکردن جۆرێکە لەخۆنواندن.

## ٥٤٠- ئۆسكار وايلد

من حەز ناکەم خەڵكی لەپشتی سەرمەوە چی دەڵێن. ئەم کارە لەڕادەبەدەر من خۆپەسندو خۆویست لێ دەکات.

## ٥٤١- پيتەر يۆستينۆف

پاڤاروتی کەسێکی خۆپەسەند نی یە. ئەوەی کە هەیە لەبێ هاوتایی خۆی ئاگادارە.

## ٥٤٢- سيريل كانولى

زۆركەس لەبەر ئەوە دەست نادەنە خۆكوشتن كە بيردەكەنەوە دەرودراوسێ چی دەڵێن!.

## ٥٤٣- فردريك نيچە

بيركردنەوە لە خۆكوشتن دڵدانەوەيەكی بەهێزە. چ جای شەوگارە ناخۆشەكان كەبە خەياڵی ئەوەوە دەتوانرێ بەسەر ببرێت.

## ٥٤٤- لويس B. نەزير

هەندێ كەس بەهەر قسەيەك باوەڕ دەكەن بەمەرجێك بەتەلەفون پێيان بڵێيت.

## ٥٤٥- وودی ئالن ومارشال بريكمەن

ژيانی مرۆڤ دابەش بووە لەنێوان ترس و شپرزەيی.

## ٥٤٦- بەرنامەی لاف ئين .NBC. ساڵی ١٩٦٩

بەختەوەری واتا بەر يەك كەوتن لەگەڵ ڕاكويل ويلچ.. زۆر زۆر بە ئارامی.

## ٥٤٧- ئالان بنت

ڤيرۆنيكا: ئايا تۆ خۆشحاڵيت؟.

هيلاری: بۆچی ئەمەيەكسەر لەمن دەپرسی؟. نەخێر. بەختەوەر نيم بەلام لەوبارەوە هەست بە كلۆلی ناكەم.

## ٥٤٨- ليۆتۆلستۆی

هەموو خێزانە بەختەوەرەكان وەكو يەكن. بەلام هەر خێزانێكی بەدبەخت. بەدبەختی خۆی هەيە.

### ٥٤٩- بەرتراند ڕاسل

کەسانی گرفتاریە بەدبەختی وەکو کەسانی تووشبوو بە بێ خەوی هەمیشە بەگرفتاری خۆیانەوە شانازی دەکەن.

### ٥٥٠- جۆرج برناردشۆ

دوو شت لەژیاندا کارەساتە : یەکەم نەگەیشتن بەهیواو ئامانجەکان. دووەم گەیشتن پێیان.

### ٥٥١- جۆرج برناردشۆ

بەختەوەری تا هەتایی : واتە دۆزەخی سەرزەوی. شتێك کە هیچ مرۆڤێکی زیندوو توانای بەرگەگرتنی ئەوەی نیە.

### ٥٥٢- دۆن مارکۆس

بەختەوەری هەلێکە لەنێوان دوو کلۆلیدا.

### ٥٥٣- ئیدوارد نیوتن

کارنامەی بەختەوەری زۆر سەرقاڵ بوونە لەشتە دیاری نەکراوەکان.

### ٥٥٤- گاهان ویلسون

کاتێ لاو بووم بیرم دەکردەوە کە سەروەت ودەسەلات خۆشبەختیت دەداتێ..ئێستا دەزانم بیرکردنەوە کەم ڕاست بوو.

### ٥٥٥- کین هوبارد

ووتیان ئەوەی کەچی شتێك خۆشبەختی دێنێ ئاسان نیە. هەزاری وسەروەت کەنەیانتوانی.

### ٥٥٦- جان ڕۆستان

ڕەشبینی من تا ئەو جێگەیەیە کەلەڕاستگۆیی ڕەشبینانیش گومان دەکەم.

## ٥٥٧- جۆرج برناردشۆ

دەزانی ڕەشبین بەکێ دەڵێن؟. بەکەسێك کە پێ ی وایە هەموو خەڵکی وەکو خۆی بێ قەدەر وخراپەکارە ولەبەر ئەوەیە ڕقی لەوانە.

## ٥٥٨- نەناسراو

گەشبین کەسێکە کە پێ ی وایە. ئایندە نادیارە.

## ٥٥٩- وودی ئالن

ئەم کاتژمێرە دیقەت دەدەیت؟. ئەم کاتژمێرە زێڕە بەڕاستی بەنرخ و جوان و قەشەنگە باسی شتێکی دەرککراو و ئەدەبی دەکات و باپیرم لەسەرە مەرگدا پێ ی فرۆشتووم.

## ٥٦٠- A.A میلەر

کەروێشك ووتی:" نامەوێ ببینم. بەڵام هەمیشە قازانجتە بزانی کە خزم و دۆستانت لە کوێن. ئێستا چی بتەوێ بیانبینی چی نەتەوێ. "

## ٥٦١- ترینس

نزیکترین خزمم خۆمم.

## ٦٦٢- H.M بیوچات

( دەست نووسێك لەسەر تابلۆی سەرجادەکە)

ئاگاداری قوتابیان بە. بەتایبەت کاتێك خەریکی شۆفێرین!.

## ٥٦٣- واڵتەر ڕالی

لەکاتی تاقیکردنەوەدا کەسانێك کەنایانەوێ شتێك فێربن پرسیار لە کەسانێك دەکەن کە ناتوانن شتێك بڵێن.

## ٥٦٤- بڵاوكراوەی نەشناڵ ئۆبزێرڤەر

مامۆستا بەمامۆستایەكی تر : ئەم قوتابیە بەدەر لەوەی كە بێ ڕەفتار ترین قوتابی قوتابخانەكەیە هەمیشەش لەوانەكان ئامادەیە.

## ٥٦٥- هوریشو باتوملی

( وتارخوێندنەوە لەزانكۆی ئۆكسفۆرد)

برایانی بەرێز !.. من لە ئیمتیازاتی ئێوە بەهرەیەكم وەرنەگرتووە. ئەم زانیاریە كەمەم هەمووی لە زانكۆی ژیان بەدەست هێناوە.

## ٥٦٦- ماكس بیربووم

من كوڕێكی شەرمن و بەقسەوپێكەنین بووم. ئۆكسفۆرد بوو كە لەمن كەسێكی بێ حەوسەڵەی دروستكرد.

## ٥٦٧- .L. بین

لەیەكێك لەفارغۆنەكانی شەمەندەفێری لەندەن پیاوێك جگەرەیەكی لە گیرفانی دەرهێنا و بەژنێكی بەساڵاچوو كە لەبەرامبەری دانیشتبوو ووتی :" ببورە خانم یارمەتی هەیە جگەرەبكێشم؟.".

ژنەكە ووتی :" ئازادبە. ئێرە بەماڵی خۆتان بزانە".

كابرا ئاهێكی هەڵكێشا ووتی :" زۆرباشە.". وجگەرە كەی بەنیگەرانیەوە خستەوە گیرفانی.

## ٥٦٨- وابەستەبە : .C.W. فیلدز

من تا نۆ ساڵان هەرگیز لێوم بەجگەرەوەنەدا.

### ٥٦٩- نێردراو ئانا.M. کروان

کاتێك لەجێگەیەك خوێندیەوە جگەرەکێشان دەبێتە هۆی شێرپەنجە. ئەوەندە دلگران بوو کە بەتەواوی وازی لە خوێندن هێنا.

### ٥٧٠- نێردراو.تۆنی گاد

پیی.کە پیاوێك کەکاتێك دەگاتە ژێر پردەکە بەفر پاککەرەوەکەی دەکوژێنێتەوە.

### ٥٧١- ئیدوارد بلومر لیتۆن

دانەیە جگەرەی باش بۆ پیاو ئەوەندە ئارامی بەخشە کە وەرزی گریانێکی دروست وچاکە بۆ ژن.

### ٥٧٢- ئۆسکار وایلد

جگەرە نموونەیەکی تەواوە لە چێژێکی تەواو. هەم بەدڵەوە دەچەسپێ و هەم مرۆڤ بەناڕازی دەهێڵێتەوە.

### ٥٧٣- ئەندریا k یومان

تەنیا ئەوەی کەسێك چیتر شێرپەنجەی هەیە. بەڵگەی ئەوە نیە کەئازاری دەردی ددان هەست پێ نەکەین.

### ٥٧٤- ئەدلی ستیڤنسۆن

( لەپێشبرکێی هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆمار)

پێشنیاری ڕیککەوتن دەکەم لەگەڵ ڕکابەرەکانم: ئەوان لەدرۆ وتن دەربارەی ئێمە دەست هەڵگرن تامنیش لەووتنی ڕاستیەکان لەسەرئەوان واز بێنم.

## ٥٧٥- میشێل دی مۆنتانی

مرۆڤـ تا لەبیرکردنەوەی خۆی دڵنیا نەبێ نابێ پەنا بۆ درۆ ببات.

## ٥٧٦- ماری مەك کارتی

( دەربارەی لیلیان هڵمەن)

دانە دانە ئەو ووشانەی ئەم ژنە دەینوسێ درۆیە. تەنانەت " ڕ" وە " ك" ش.

## ٥٧٧- فرانکلین..P. ئادامس

ئەوەی کە کەسانێك لەهەڵبژاردنەکان براوە دەبن زیاتر بەهۆی ئەوەوەیە کە زۆربەی خەڵك دەیانەوێ دژ بەفلان دەنگ بدەن نەك بەقازانجی ئەویان.

## ٥٧٨- تۆم ستۆپارد

دیموکراسی لەدەنگ ژماردن دەردەکەوێ نەك لەدەنگدان.

## ٥٧٩- جۆرج ئورۆل

هەموو ئاژەڵان بەرابەرن بەڵام هەندێکیان بەرابەرترن.

## ٥٨٠- ئەنورین بیڤان

(وتار خوێندنەوە لەئەنجومەنی گشتی)

خراپترین شتێك کەسەبارەت بە دیموکراسی بیڵێم ئەوەیە کە هەر ئەم دیموکراسی یە بوو کە ئەم بەرێز( نیڤل چەمبەر لاین) ی چوارساڵ ونیو تەحەمول کردوە.

## ٥٨١- بنجامین دیزریلی

زۆرینە هەمیشە وەڵامی لاوانە.

## ٥٨٢- C.W. فیلدز

خوا لەناوی ببا. من هەمیشە دژ بەکەسێك دەنگ دەدەم نەك هاوڕای کەسێ.

## ٥٨٣- ئۆسکار وایلد

دیموکراسی بەواتایەکی سادە، یانی لێیانی خەڵك بەدەستی خەڵك وبۆ خەڵك.

## ٥٨٤- ئۆسکار وایلد

پادشایانی باش، تەنها دوژمنانی مەترسیدارن کە دیموکراسی ئەمڕۆیی هەڕەشە لێ دەکەن.

## ٥٨٥- جۆرج برناردشۆ

پشووی هەمیشەیی: ئەوەیە. یەکێك لە پێناسەکانی کارامەی دۆزەخ.

## ٥٨٦- هینری برۆکس ئادامس

هاوڕێ ی بەدەسەلات.هاوڕێ یەکی لەدەست چووە.

## ٥٨٧- لۆگان پیرساڵ سیمس

کەموکوڕی کۆمەلایەتی هاوڕێکانت بەوان مەڵێ. بۆچی چونکە کەموکورتیەکان دەخەنە لاوە و ڕق بەرامبەر تۆ دەگرنەدڵ.

## ٥٨٨- بەرتۆلت برشت

پێکەوە هاوڕێین. چونکە متمانەم بەئەو نی یە.

## ٥٨٩- سال بلو

هەر کەسێك بەباشی شتێك هەیە کە خۆشی بوێت.

**٥٩٠- ترینس**

لەنێو هەموو هاورێکانمدا تەنها خۆم ماومەتەوە.

**٥٩١- K.G. چیستەرتۆن**

کتێبی پیرۆز پێمان دەڵێت دراوسێکان ودوژمنانمان خۆشوبێت. ڕەنگە لەبەر ئەوەی ئەو دووەیەکن.

**٥٩٢- نۆرمان دوگلاس**

بۆ دۆزینەوەی هاوڕێ دەبێ یەك چاوی خۆت ببەستی و بۆ پاراستنی دەبێ هەردوکیان.

**٥٩٣- بەرتراند ڕاسڵ**

ئەگەر هێزی جادویی توانای خوێندنەوەی مێشکی یەکتری بەئێمە بدایە. یەکەم دەرەنجامی پێکدادانی هاوڕێ یەتیمان دەبوو.

**٥٩٤- ولیام شکسپیر**

جۆك: ناویم خۆش ناوێت.

ئۆرلاندو: ئەوکاتەی کەناویان لێ دەنا کەسێ لەبیری بەخێرهێنانی تۆ نەبوو.

**٥٩٥- مارشاڵ دی ڤیلارس**

خودایە من لە خراپەی هاورێکانم بپارێزە. لە خراپەی دوژمنانم خۆم دەپارێزم.

**٥٩٦- ئەلبێرت هوبارد**

هاورێت کەسێکە کەلەهەمو شتێکت ئاگادارە و بەوشێوەیە خۆشتی دەوێ.

## ٥٩٧- فیۆدۆر دەستۆفسکی

مرۆڤەکان پێغەمبەران لەخۆیان دوور دەخەنەوە و دەکوژن بەڵام شەهیدانی خۆیانیان خۆشدەوێ، وە ئەوانەی کە کوژراون بەشکۆمەند دەزانن.

## ٥٩٨- لستەر بۆلس پیرسۆن

تایبەتمەندی سەرەکی دیپلۆمات ئەوەیە کە " نەخێر" بەشێوەیەك دەڵێ کە بە " بەڵێ" وەری بگری.

## ٥٩٩- فردریك سایر

دیپلۆمات کەسێکە کە پێش ئەوەی قسە بکات دووجار بیر دەکاتەوە.

## ٦٠٠- رۆبەرت فروست

دیپلۆمات کەسێکە کە ڕۆژی لەدایکبوونی ژنانی لەبیرە بەڵام تەمەنیان هەرگیز.

## ٦٠١- وین کانلین

دیپلۆماسی هونەروگۆرانی " سەگی میهربان"ووتنە تاکو دەستت دەکاتە تاشەبەردێك.

## ٦٠٢- هەنری کیسنجەر

هەفتەی داهاتوو تەنگژەیەك لەکاردا نی یە. بەرنامەکانی من پێشتر ئامادەکراوە.

## ٦٠٣- هەنری واتۆن

باڵوێز کەسێکی بەرێزە کە بۆ دەرەوەی وڵات دەنێردرێت تا بەقازانجی وڵاتەکەی درۆ بکات.

## ٦٠٤- وینستون چەرچڵ

دیکتاتۆرەکان سواری پڵنگ بوون و بەم لاوبەولادا پەلامار دەدەن و ناوێرن دابەزن لەسەریان وپڵنگەکان سات بەسات برسی تر دەبن.

## ٦٠٥- دانیێل دیفۆ

خراپترین بەڵایەك کەتائێستا داوێن گیری مرۆڤ بووە دیکتاتۆر و ملهوڕی کلێسایە.

## ٦٠٦- بەرتراند راسڵ

کاری بنەڕەت ئەوەیە کە مرۆڤ تا ئەو جێگەیە ڕێز لە بیروڕای گشتی بگرێت کە بۆنەمردن لەبرسیاو نەکەوتنە ناوزیندان پێویستە، بەڵام لەمە زیاتر شتێك نی یە جگە لە خۆبەستەوەدانی بەئارەزوو بە ملهوڕیەکی نا پێویست.

## ٦٠٧- پەندی هندی

دیکتاتۆرەکان سواری پشتی پڵنگ بوون و ناوێرن لێ ی دابەزن.

## ٦٠٨- وابەستە بە : کاترینی گەورە.

من سەرەڕۆ دەبم. ئەمە کاری منە. وخواوەندی گەورە من دەبەخشێت : ئەمەش کاری ئەوە.

## ٦٠٩- کاساندرا ( ولیام کانور ) ( سەبارەت بە مەرگی ستالین )

بەپەنجە دەژمێردرێن کەسانێك کە دەتوانن بەمردنی خۆیان ببنەمایەی خۆشحاڵ ئەو هەموو خەڵکە.

## ٦١٠- جان ماساریك

دکتاتۆرەکان ئەو فەرمانڕەوایانەن کە تادەخولەك پێش لەناوچوونیان بە ئاراستەیەکی دیار دەچنە پێشێ.

## ٦١١- ئەلدۆس هاكسلی

تا ئەوكاتەی كە خەڵكی سەزارەكان و ناپلیۆنەكان دەپەرستن، ئاسایی یە كە سەزارەكان و ناپلیۆنەكان پەیدا دەبن و چارەنووسی ئەوان بەڕۆژی ڕەش دەگەیەنن.

## ٦١٢- سیدنی سمیس

بەووتەی فەرەنسییەكان ڕەگەز سێ جۆرە: پیاو، ژن، قەشە.

## ٦١٣- جان باچان

بێ باوەڕ كەسێكە كە پاڵپشتی نادیاری نی یە.

## ٦١٤- ریچارد بانكرۆفت( ڕوحانی گەورەی بەریتانی )

هەرجارێك مەسیح كلێسایەك دروست دەكات. شەیتانیش دیسان لەحەوشەی ئەوێدا كلێسایەكی بچووك دروست دەكات.

## ٦١٥- لۆرد بایرون

من هەمیشە بەڕۆژە هەتاوییەكان لەكاتەكانی تر زیاتر مەزهەبی دەبم.

## ٦١٦- ڤالانتاین بلاكەر

كوڕەكانم پشت بەخودا ببەستن وتوڕەیی خۆتان بپارێزن.

## ٦١٧- لویس بۆنویل

سوپاس بۆ خوا كە هێشتا خودا ناناسم ! !.

## ٦١٨- وابەستە بە نجامین دیزریلی

واڵدەر شیر ووتی : ئاوەزداران هەموویان ئەندامی یەك مەزهەبن.

-.... تكایە بفەرموون ئەو مەزهەبە كامەیە ؟.

-ئاوەزداران ناڵێن.

## ٦١٩- جۆرج برناردشۆ

مەسیحیەت هەرگیز نەیتوانی دونیا کۆنترۆڵ بکات، مەگەر سەردەمێ کە بەعەمەلی ئەمەی زیاتر نەوێ کە هاوڵاتی سڤیل ڕۆژی حەوتەمی هەفتە دووسێ کاتژمێر کاتی خۆی بەمەزهەبەوە خەریك بکات و ئەوانی تر وەك خۆیان بن.

## ٦٢٠- جۆرج برناردشۆ

مەزهەب یەکەو گەرچی بەسەدان گێڕانەوەی جیاوز.

## ٦٢١- پندی ئیتالی

لەژێر ناوکدا هەواڵێك لەدین و ئیمان نی یە.

## ٦٢٢- گروچۆ مارکس

( لەوەڵامدانەوەی قەشەیەك کە سوپاسی کردووە ووتبووی :" لەبەر ئەو هەموو شادیەی کەبەجیهانت داوە سوپاست دەکەم ! "

منیش لەبەر ئەو هەموو شادیەی کە لەجیهان نەتهێشتووە سوپاست دەکەم.

## ٦٢٣- L.H مینکن

ئەمرۆ پێشگیری لەبارداری بۆ ژنی کاتۆلیکی بەپەنابردنە بەر زانستی ماتماتیك بەتەواوی یاسایی یە، کەچی سوود وەرگرتنی ئەو لەزانستی فیزیکی وکیمیایی بۆ ئەو مەبەستە قەدەغەیە.

## ٦٢٤- ئیڤلین وا

جۆریك ئادەمیزاد بەناوی( قەشەی ئەمرۆیی) هەیە لەکاتی بەرهرەمەندی لەمافی ڕوحانیەکی موچەخۆر، خۆی بەپابەندی هیچ بیروباوەڕێکی مەزهەبی نازانێت.

## ٦٢٥- ساموێل بیکت

هەموو ئێمە بەدێوانەیی دێینە دونیاوە.هەندێکمان بەوحاڵەوە دەمێنینەوە.

## ٦٢٦- سۆڵ بلوو

" موزس هێرزۆگ" لەگەڵ خۆی ووتی : شێتم کەشێتم: بەلای منەوە کەمووکورتی تیا نیە.

## ٦٢٧- دیوجنس

بووختان، هات وهاواری شێتەکانەو بەس.

## ٦٢٨- باج رۆسلز

شێتی میراتی یە. لەمنداڵەکانتانەوە دەگات بەئێوە.

## ٦٢٩- رینە دیکارت

مێشکی تەواو کالآیەکە کە لەهەموو شتێ باشتر لەدونیادا دابەش بووە.

چونکە هەموو پێیان وایە بەرێژەیەکی کەم بەهرەمەند بوون لێ ی.

## ٦٣٠- وابەستە بە: جیمس دیوار

هزر وەکو پەرەشووت کاتێك کار دەکات کە بکرێتەوە.

## ٦٣١- فینلی پیتەر دۆن

بەزۆر دەکرێ کەسێك بنێردرێتە زانکۆ بەلآم بەزۆر ناتوانرێت کەسێك ناچار بەبیرکردنەوە بکەیت.

## ٦٣٢- ئەمبرۆس بیرس

مێشك شتێکە کە بەو بیر دەکەینەوە، کە بیر دەکەینەوە.

## ٦٣٣- دوروتی پارکەر

هەموو ئەو کەسانەی کەلەسەر مێزەکە بوون بۆ سەماکردن لە جێ ی خۆیان هەستان جگە لەمن و ئەو. من کە تازە کەوتبوومە داوەوە. وەکو داوێك کە کەوتبێتە داوێکی ترەوە.

## ٦٣٤- S.R سورتیز

هەموو دەزانن کە پیاو لەکۆڕی سەماکردن یان بەدوای ژندا دەگەڕێ. یان ئاگای لەژنەکەی خۆیەتی. یان ئاگای لەژنێکی کەیە.

## ٦٣٥- جۆرج برناردشۆ

سەماکردن دەربڕینی ستوونی ئارەزوویەکی ئاسۆیی یە.

## ٦٣٦-لویس کارۆڵ

دەتەوێ، ناتەوێ، دەتەوێ، ناتەوێ, دەتەوێ سەمابکەی؟.

## ٦٣٧- بروس پاترسون

دەروونناس کەسێکە کە کاتێك کچێکی جوان دێتە ژوورەوە ڕوخساری کەسانی تر تەماشا دەکات.

## ٦٣٨- جروم لاورینس

دەروون نەخۆش کەسێکە کە کۆشکێکی خەیاڵی دروست ددکات. نەخۆشی دەرونیش کەسێکە کەلەم کۆشکە دا دەژی وپزیشکی دەرونیش کەسێکە کە کرێ ی نرخی ئەم کۆشکە وەردەگرێت.

## ٦٣٩- جۆن ڤان

دەروونناسی وەسیەت دەکات بۆ باوکان ودایکان. کاتێکی زۆرتر لەگەڵ منداڵەکانیان بەسەربەرن لەواقعدا بۆ کاسبی ئایندەی خۆیان بازاریان گەرم دەکات.

## ٦٤٠- فرانكلین .P. ئادامس

کاتێك نووسەرانی بابەتی سیاسی دەڵێن " هەر مرۆڤێکی بەشعور" مەبەستیان خۆیانە و هەرکاتێك خۆ کاندیدکارانی هەڵبژاردن لە" هەموو دەنگدەرانی هۆشیار"داوای پشتیوانی دەکەن مەبەست لەهەمو کەسانێکە کە دەیانەوێ دەنگیان پێ بدەن.

## ٦٤١- ئەدلی ستیڤنسون

دیقەت کردن بۆ ڕۆژنامە وەکو شەرمە بۆ ژن. بەجیاوازی ئەوەی کە ڕۆژنامە هەرکاتێك بیەوێ دەتوانێت شتی درۆ چاپ بکات.

## ٦٤٢- ئەلبێرت هوبارد

سەرنووسەر : کەسێك کە ڕۆژنامە دایدەمەزرێنێ تا گەنم لەکا جیا بکاتەوە و ئاگادار بێت کە کا بەچاپ بگەیەنێت.

## ٦٤٣- نیکولاس بریتۆن

لەگەڵ چۆلەکەکان هەڵدەسم لەخەو و لەگەڵ مەڕەکان دەنووم.

## ٦٤٤- ولیام کۆپەر

خواوەند لادێی دروست کردو مرۆڤیش شار.

## ٦٤٥- مەلیکە ماری

( مەلیکە ماری دوای ئەوەی لەکاتی جەنگی جیهانی دووەم گوێزرایەوە بۆ ناوچەی کوێستانی بادمینتۆن:"

ئا کەواتە.کا,کە, دەڵێن ئەمەیە ! .

## ٦٤٦- ئۆسکار وایلد

لەگوند دا هەر کەسێك دەتوانێ باش بێت.

## ٦٤٧- ماكس بیر بووم

لەدونیا هیچ کەسێك تا ئەو جێگەیەی کە من دەزانم( بیرتان نەچێ کە من ساڵانێك لەسەرچاوەکانی لێکۆڵینەوە و بۆ ئەو کارە هاوکار بووم). لەبەر بەهەندوەرنەگرتنی هۆشیاری توێژی گەورەی کەسانی ئاسایی پارەیەکی خەرج نەکردووە.

## ٦٤٨- L.H. مینکن

کەمتر کەسێکی چاکەکارم دیوە کە ڕوخسارێکی جوانی هەبێ وبەسە کە ڕواڵەتی ئەم جەماعەتە لاوەکانی لەخەریکبوون بەخوێندن ولێکۆڵینەوە وەستاندوە.

## ٦٤٩- لۆرانس ستێرن

لەهەموو ڕوو دەربایسی یەکانی دونیای ڕیارکاری، ڕوو دەربایسی لەڕەخنە ئازار چێژ ترە. ڕەنگە ڕیاکاری خەڵکی دوور ڕوو لەهەمو خراپتر بێت.

## ٦٥٠- لۆرد بایرون

لەبەریتانیا تەنها ڕێزلێنان لەبەرامبەر چاکەدا  ڕیاکاری یە.

## ٦٥١- فرانسوا دۆك دیلاڕۆشفۆکۆ

ڕیارکاری ڕێزگرتنی خراپەیە لەچاکەکردن.

## ٦٥٢- چارلز دیکنز

ئێمە زۆر زۆر سادەو ساکارین.

## ٦٥٣- جودیت مارتین

ڕیارکاری ئاسایی نەك گوناهێکی کۆمەلایەتی یە بەڵکو بە چاکە دەژمێردرێت.

## ٦٥٤- سامرست موام

ڕیارکاری دژوارترین وڕارایی ترین خراپەکاریە کە مرۆڤ دەتوانێ دوای بکەوێ : بوونی چاودێرییەکە کە هەمیشەیی وشڵەژانێکە سەیر. وەکو ژنی باردار وسك هەڵئاوسان نی یە کە بتوانرێ لەکاتی پشوودا پێوە سەرقاڵ بیت، کارێکە لەهەموو کاتێکدا.

## ٦٥٥- باربارا ئستریسەند

( دەربارەی بیل کلینتۆن ١٩٩٨)

ئێمە سەرۆك کۆمارمان هەڵبژاردوە نەك پاپا.

## ٦٥٦- ئەدلی ستیڤنسون

لەئەمریکا هەر کوڕێکی منداڵ ڕەنگە ڕۆژێك ببێت بەسەرۆك کۆمار.

## ٦٥٧- دیڤید برودمر

کەسێك ئەوەندە عاشقی پۆستی سەرۆك کۆماری بێت کەئامادەبێت دووساڵی تەواو لەپێناوی ئەو ئامەنگ بگێڕێ و تیبکۆشێ بەشێوەی دڵنیایی شایستەی ئەم پۆستە نی یە.

## ٦٥٨- هاری. S. ترومان

لەچەند مانگی یەکەمدا تێگەیشتم کە سەرۆك کۆمار بوون وەکو سوارچاکی یە بەپڵنگ.یا دەبێ هێرش بکەیت یان قووت دەدرێ ی.

## ٦٥٩- S.T ئیلیوت

کاتێك لەگەڵتدا قسەدەکەم دەبێ لەووشەکان سوود وەرگرم.

## ٦٦٠- بریل پیزمر

نازانم ئێستا که هەموو بەزمانی شوفێرانی کامیۆن قسە دەکەن. خودی شۆفێران بەچ زمانێك قسە دەکەن.

## ٦٦١- مارك توین

( دەربارەی بەکارهێنانی ڕاناوی یەکەمی کەسی کۆ)

مافی سوود وەرگرتن لە دەستەواژەی ( ئێمە) لەووتاری ڕۆژنامەکانی تایبەت بەسەرۆك کۆمار،سەرنووسەرەکان وئەوانەن کە کرمی شریتیان هەیە.

## ٦٦٢- وابەستە بە : مەدام دی ستاڵ

( کاتێ لێیان پرسی لەگەڵ خۆشەویستەکەی باسی چی دەکات لەوەڵامدا ووتی :"

ئەو بەووشە قسە ناکات.

## ٦٦٣- ریچارد پرنسلی شریدان

باوەڕکە بۆ من تێگەیشتن لەقسەکانی وەرگێڕی ئەو کابرایە سەخت ترە لەقسەکانی خۆی !.

## ٦٦٤- ولیام شکسپیر

مەگەر نازانی من ژنم ؟. بەبیرکردنەوە لەکات دەبێ قسە بکەم.

## ٦٦٥- هاینریش هینە

ئەگەر بڕیار بوایە ڕۆمەکان پێش دەست دانە هەرکارێك سەرەتا زمانی لاتینی فێر ببوایەن. هەرگیز دەرفەتی کردنەوە بەڕووی جیهانیان دەست نەدەکەوت.

## ٦٦٦- ساموئیل بیکت

ڤلادمیر : بەم شێوەیە کات بەسەر چوو.

ئیستراگۆن: کات بەهەر شێوەیە بێ تێدەپەڕێ.

ڤلادمیر: بەڵام نەك بەم خێراییە یە.

## ٦٦٧- ئیزاك دیزریلی

تۆ دەڵێ ی کات لە تێپەڕیندایە؟. ئا، نەخێر، کات دەمێنێت،ئێمە دەڕۆین.

## ٦٦٨- لۆرد چستەر فیلد

وەسیەت دەکەم ئاگات لەخولەکەکان بێت. چونکە کاتژمێرەکان خۆیان ئاگایان لەخۆیانە.

## ٦٦٩- مایکڵ کۆلینز

( کاتی مایکل لەژانویەی ١٩٢٢. بۆ وەرگرتنەوەی دەسەڵات لە هێزەکانی بەریتانیا چووە ناوکۆشکی دبلن پێیان ووت کە حەوت خولەك دواکەوتووە ! )

- ئێمە (٧٠٠) ساڵ چاوەڕوانیمان کرد.چی دەبێ ئەگەر ئێوە (٧) خولەك چاوەڕوان بن.

## ٦٧٠- ئۆسکار وایلد

ژنان لەکاتێکدا بەتەواوی دڵخۆش دەبن کە دەساڵ گەنجتر لەکچەکانی خۆیان بێنە پێش چاو.

## ٦٧١- W.B ئولیڤەر

لەپشتی سەری هەر پیاوێکی سەرکەوتوو. ژنێك پەنجەی لەدەمدایە وەستاوە.

**٦٧٢- وابەستە بە : گلۆریا ستینم**

ژنی بێ پیاو وەکو ماسی بەبێ پاسکیل وایە.

**٦٧٣- ریچارد ستیل**

ژنان، ئاسایی نیەتی خۆیان ناخەنە سەرکاغەز، مەگەر لەپەراوێزدا.

**٦٧٤- کۆرنیلائۆتیس سکینەر**

ژنان گۆشەیەکی تایبەتیان لەدڵیان بۆ گوناهەکانیان داناوە کە هەرگیز دووچاری نەبوون.

**٦٧٥- J.P. ئۆرۆرك وجۆن هیوز**

کاتێك پیاوێك حەز بەجەستەی ژنێك دەکات،ژنەکە ئەوسەرزەنشت دەکات کە تەنها ئەوی خۆشدەوێ ودوبارە کاتێ پیاوەکە حەزی لەجەستەی ئەونی یە. ژنەئەوتۆمەتباردەکات کە جەستەی ژنێکی تری خۆشدەوێت.

**٦٧٦- ئۆڤید**

ژنان چی سەری بەخشندەیان هەبێ ، چی لەدەرگایەکەوە خۆیان بپارێزن، لەهەردوبارەکەدا خواستی ئێوەیان لامەبەستە.

**٦٧٧- سامونێل باتلەر**

بیستم پیاوێك دەیگوت چەتەکان یان ماڵاتیان دەوێ یان گیانت، بەڵام ژنان هەردوکیان بەیەك جار دەوێت.

**٦٧٨- نومی بلیڤن**

لەپشتی سەری نزیکەی هەموو ئەو ژنانەی کەناویانم بیستوە.پیاوێك وەستاوە کە نائومێدی کردووە.

## ٦٧٩- جۆرج بورن

ژنان كاتێك دەترسن لەهەركاتێكی تر سەرنج ڕاكێشتر دەبن. لەبەر ئەوە

هیچ شتێ نەبووە، ترس دایاندەگرێت.

## ٦٨٠- فرانسیس باكۆن

ژن لەگەنجێتی پیاودا، خۆشەویستی ئەو لەبەساڵاچووندا هاودەم

وهاوڕێ،ولەڕۆژگاری پیریدا پەرستیاری ئەو.

## ٦٨١- نێردراو: فیلیپ پین

كچێك كە ددانی جوانی هەبێ.مەحاڵە قسەی خۆش وەرنەگرێت.

## ٦٨٢- سكۆت..E. فیتس جیراڵد

ئەم ژنە دەنگی لێو ڕێژە لەپارە.

## ٦٨٣- ئەنتۆن چیخۆف

كاتێك ژنێك جوان نی یە خەڵكی بەردەوام دەڵێن :" بەهـ.بەهـ.چی

چاوانێكی جوانت هەیە. پرچت چەند جوانە.".

## ٦٨٤- گرافیتۆر- نیۆیۆرك ١٩٨٢.

ژنێك كە هەموو هەوڵێكی ئەوەیە كە وەكو پیاوی لێ بێت بەرز ویستی نیە.

## ٦٨٥- هیلینا ڕوبنشتاین

ژنی خراپ بوونی نیە. شتێك كە هەیە. هەندێ لەژنان تەمبەڵن.

## ٦٨٦- مۆرتیز.G.سافیر

ئاوێنە ویژدانی زیندوی ژنانە. بەبێ ڕاوێژی ئەو مەحاڵە دەست بەكارێكەوە

بدات.

**٦٨٧- S.R سورتیز**

ژنە گەنجەکان بەجۆش وخرۆشی تەواو بەدوژمنیەکی خوشکانە هاتنە

ژووری پێشوازیەوە.

**٦٨٨- S.R سورتیز**

سێ شتم هەرگیز بەکەس بەقەرز نادەم : ئەسپەکەم،ژنەکەم، ناوم

**٦٨٩- جۆرج برناردشۆ**

ماڵەوە زیندانی کچان و خەڵوەتگەی ژنانە.

**٦٩٠- جۆرج برناردشۆ**

تۆ دەربارەی جیاوازی ژنێکی گەنج لەگەڵ ژنێکی گەنجی تردا وەکو هەموو

پیاوە گەنجەکان لەڕادەبەدەر زیادە ڕەوی دەکەی.

**٦٩١- جۆرج برناردشۆ**

ئەو ژنە هونەری ووتن وبیستنی لەدەست دابوو. بەڵام بەدبەختانە توانای

قسەکردن نە.

**٦٩٢- .J. فینجەر**

ژنان لەژیاندا عاشقی شتەسادەکان دەبن و چی شتێك سادەترە

لەپیاوەکان.

**٦٩٣- .J کارتەر**

چەندین جار هەر هەوڵم داوە گرفتاریەکانم بدەم بەئاودا. بەڵام تا ئێستا

نەمتوانیوە ژنەکەم قەناعەت پێ بێنم بچێت مەلە بکات.

**٦٩٤- هانا کاولی**

ئاخر مەگەر ژن چی یە ؟ هەڵەیەکی چاپکراوی سروشت و هیچی تر.

**٦٩٥- سکۆت .M.کرۆز**

ژینگه ناسی دەڵێ که ئەگەر شتێك گازی لێ گرتن ئەگەری مێینه بوونی دابنێن.

**٦٩٦- .E.کریگ**

ئەگەر ئارەزووی شوفێری دای لەسەر ژنەکانتان لەبەردەمی مەوەستە.

**٦٩٧- نێردراو: فیکتۆر گرانت**

بەگومانی من ئەندامانی زانکۆی پزیشکی ددان تەنها کەسانێکن که بێ مەترسی دەتوانن بەژنێك بڵێن کەی دەمی بکاتەوە وکەی بیبەستێت.

**٦٩٨- ڕونا گریر**

هەرگیز لەهێزی دەستنیشانکردنی ژنەکەت چون وچەرامەکە. بزانە لەگەڵ کێ هاوسەرگیری کردوە.

**٦٩٩- جیمس مەك لود**

ژن بەمێردەکەی : یەکێك لەماسیه قزلەکان که هەفتەی ڕابوردو بۆشکاری چوو بووی زەنگی داو ژمارە تەلەفونەکەی جێ هێشت.

**٧٠٠- جۆرج مردیت**

پێشبینی دەکەم ژن دواین بونەوەرە کە بەدەستی پیاو ماڵی دەبێت.

**٧٠١- L.H مینکن**

پیاوان وژنان بەلای کەمەوە لەسەریەك بابەت کۆکن. هیچ کامیان باوەڕیان بەژنان نی یە.

## ٧١٥- جیم باکۆس

زۆرن ئەو پیاوانەی کە سەر کەوتوویی خۆیان بەقەرزارباری ژنی یەکەمیان دەزانن و ژنی دووەمیان بەقەرزارباری سەرکەوتنی خۆیان.

## ٧١٦- نێردراو: D.B.P بونیان

ژنی مەترسیدار بوونی نیە. پیاوەکان خۆیان زەرەر مەندن.

## ٧١٧- جیل تویدی

بەوکارانەی کە پیاوان بەویستی تەواو دەیدەن بەژنان بەگومانەوە تەماشای بکە.

## ٧١٨- پاول جیرالدی

هەر کە نەتوانی شتێك لەژنێك بشاریتەوە بزانە کە خۆشت دەوێ.

## ٧١٩- وابەستەبە: وینستۆن چەرچل

من وژنەکەم دەمانویست هەر ڕۆژێ پێکەوە قاوەڵتی بکەین.بەڵام بە ناچار. چاومان لەم کارە پۆشی. چونکە ژیانی هاوبەشمان لەمەترسیدا بوو.

## ٧٢٠- جۆرج برناردشۆ

" ژنێکی نەناسراو بۆ برناردشۆی نوسی تۆ هۆشیارترین پیاوی دنیای، من جوانترین ژنی دنیا. پێشنیار دەکەم پێکەوە ببین بەهاوسەر تا ببین بەخاوەنی تەواوترین منداڵی دونیا. برناردشۆ لەوەڵامدا نووسی:" ئەگەر منداڵە کە جوانی لەمن و هۆشیاریش بەمیرات لەتۆ ببات، ئەوکاتە چی خاکێك بەسەر خۆماندا بکەین؟.

### ٧٢١- جۆرج برناردشۆ

سەنگی مەحەکی پەروەردەیی هەر پیاو ژنێك شێوەی ڕەفتاری ئەوە لە شەڕوئاژاوەدا.

### ٧٢٢- ریچارد برنسلی شریدان

( لەبانگ کردنی ژنێکی گەنجدا)

تکایە وەرە ناوباغەکەی من. دەمەوێ تۆ بەگوڵەکانم ئاشنا بکەم.

### ٧٢٣- میلی سنت فینویك

( لەوەڵامدانەوەی یەکێك لەهاوکارەکانی لەکۆنگرە کە لەگەڵ هێرش کردنە سەربەشێك لەیاسای مافەکانی ژنان. ووتبوی : ڕای من هەمیشە ئەوەبووە کە ژنان بەکەڵکی بۆنکردن و ماچکردن و لەباوەشکردن دێن.".

منیش دەربارەی پیاوان هەروا بیرم دەکردەوە : تەنها ئومێدەوارم تۆ ئەوەندەی من نائومێد نەبووبیت.

### ٧٢٤- نێردراو: ئانە.M. کیروان

پیاو بەژنەکەی : پێت وانەبێ من خێزانی ئێوەم خۆش ناوێت. بەڕاستی من خەسووی تۆم زۆرتر لەدایکی ژنەکەی خۆم خۆشتردەوێت.

### ٧٢٥- نێردراو: M.D کلارك

مێرد( لەکاتی شەڕو ئاژاوەی خێزانی :" ئێستا وەرە سەبارەت بەوبابەتە مەنتقیانە قسە بکەین.

ژن: نەخێر. بەو شێوەیە هەمیشە تۆ براوە دەبیت.

## ٧٢٦- نێردراو: ئارسەر. J.لویس

لاوێکی گەنج: ئاگاداری کەمن وخوشکەکەت دەمانەوێ پێکەوە هاوسەرگیری بکەین ؟

برابچوکی کچەکە: بە ! تازە زانیوتە ؟.

## ٧٢٧- پاول ڤالیری

کاتێك خواوەند پیاوی دروست کرد بینی ئەو بەوشێوەیەی کەدەبێ نابێ تەنیا بێ ئینجا هاودەمێکی بۆی دروست کرد تا تەنیایی زۆر کاریگەرانە هەست پێ بکات.

## ٧٢٨- ئۆسکار وایلد

دۆستایەتی نێوان ژن و پیاو بوونی نیە. لەنێوان ئەواندا دەکرێ هەست و سۆز،دوژمنایەتی، پەرستن یان خۆشەویستی هەبێ بەلام دۆستایەتی نە.

## ٧٢٩- می ویست

هەرئەوەندەی دەستی پیاوێ کراوە بێ. هەولدەدا تۆ بەدەست بگرێت.

## ٧٣٠- می ویست

باشترین ئامراز بۆ گرتنی کەسێك سوود وەرگرتنە لەبازووەکان.

## ٧٣١- ڤیکتۆریا وود

لیل : مارکۆس زیاتر حەزی لە ژنانی رۆلێ ووردیلەیە.

ڤیکتۆریا: بەلێ، چونکە ئاسانتر دەتوانێ بیانخاتە ژێر پێ لەقە.

## ٧٣٢- رۆزان ئەرنۆلد

پێشتر لەودبیرم دەکردەوە کەسێکی شیاوم بەلام ئێستا ئەبێ دانی پێدا بنێم کە چەندە ژیرانەیە مرۆڤ بگاتە ئەو دەرەنجامەی کە نەهەموو ژیانی

دەتوانیٚ شتێك زیاتر لەسی وپێنج لاپەرەبگرێتەوە ونەلەمە زیاتر قسەیەکی هەیە بۆ ووتن.

## ٧٣٣- جیمس ئەگێت

هەرکاتێك کە ژیاننامەی خۆنووسینی کەسێك بڵاودەبێتەوە پێش هەموو شتێك چاو بەڕووکاریا دەگێڕم تا بزانم ئایا ناوی منیش هاتووە یانە و دیارە هیچ کاتێك نایەت.

## ٧٣٤- ئارسەر جیمس بلفۆر

ژیاننامەی کەسێك دەبیٚ دوژمنی سەرسەختی ئەو بینوسێت.

## ٧٣٥- هەنری فلیپ پوتن

ژیاننامەی خۆنووسین یانی بەخراپە باسکردنی هەموو جگە لەخۆت.

## ٧٣٦- کوینتین کریسپ

ژیاننامەی خۆت نووسین ڕیکلامی کۆچکردنێکە کە بەشێوەی بەش بەش نوسراوە وبەشی کۆتایی نی یە.

## ٧٣٧- هەنری کیسنجەر

من لەم کتێبەم دەربارەی خۆم بەڕاشکاوانە قسەم کردووە لەیەکەم هەڵەمد لە لاپەرەی( ٨٥٠) باسم کردووە.

## ٧٣٨- وابەستەبە : ئیڤلین وا

کاتێك مرۆڤ هەر جۆرە ووردبینی یەك لەبارەی داهاتووەوە لەدەست دەدا چیتر گەیشتوە تەمەنێك کەدەبیٚ دابنیشیٚ وژیاننامەی خۆی بنووسێت.

## ٧٣٩- جۆن ئانوی

ژیان تا ئەوکاتەی مرۆڤ دەربارەی قسە دەکات یان لەکتێبەکانی مێژوودا دەربارەی ئەو دەیخوێنێتەوە. شتێکی سەرنج ڕاکێشە. بەڵام بەعەمەلی ڕسوایی یە.

## ٧٤٠- ئەدلی ستیڤنسون

شەرکردن بەپێی بنەما زۆربەی ئاسانترە لەژیان بەگوێرەی بنەما.

## ٧٤١- ئەدلی ستیڤنسون

گرنگ چۆن ژیانە نەك چەند ساڵ ژیان.

## ٧٤٢- ئەلبێرت ئەنشتاین

ئەگەر $A$ بەسەرکەوتوویی لەژیان وەربگرین، ئەوکاتە $A$ یەکسانە بە $X$ بە کۆی $y$ وکۆی $z.x$کار، $y$ گەڕان و سەرگەرمی و $z$ لێو بەستنە.

## ٧٤٣- سامونیل باتلەر

ژیان چیرۆکێکی درێژی ماندوێتی یە.

## ٧٤٤- سامونیل باتلەر

ئەگەر بڕیارە ژیان زۆر جدی وەرنەگرین. مەرگیش نابێ زۆر جدی وەرگرین.

## ٧٤٥- دیلان تۆماس

ئای،ژیان ئایا شتێکی مەترسیدار نیە، سوپاس بۆ خوا ؟.

## ٧٤٦- سامیوئل جۆنسۆن

لەخەیاڵی دەستشتن لەجیهان مەگەر ئەوکاتەی کە جیهان لەسەر وازهێنانی تۆ خەفەت بخوات.

## ٧٤٧- ئەنتۆن چیخۆف

مەدڤیدنکۆ: بۆچی هەمیشە ڕەش دەپۆشی؟.

ماشا: ئەزیەتباری ژیانی خۆمم.

## ٨٤٨- کنت دارگینسۆن

( دوای ئەوەی دیفۆنتن شتێکی هەجو ئاسا دژی بەخێوکەرەکەی دارگینسۆن دەنوسێت:"

دیفۆنتن: دەمەوێ بژیم.

دارگینسۆن: بەپێویستی نازانم.

## ٧٤٩– نوسراوی سەر دیواری لەندەن ١٩٨٤

ژیان نەخۆشیەکی میراتی یە.

## ٧٥٠- بەرتراند ڕاسل

یان پێکەوە ژیان یانەژیان.

## ٧٥١- نیل سیمۆن

من عاشقی ئەوەم بژیم، ژیان دیارە بێ گرفت نیە، بەڵام ژیان بەسەربردن باشترین شتێکە کە تا ئێستا کەسێك بیری لێ کردوەتەوە.

## ٧٥٢- رۆبەرت فرۆست

هەموو ئەو شتەی لەبارەی ژیان فێر بووم لەیەك ووشە کورت دەکرێتەوە : بەسەر دەچێت!.

## ٧٥٣- ئەبراهام کاولی

ژیان نەخۆشیەکی بێ دەرمانە.

### ٧٥٤- ڕێنە کوتی

تەمەنێکم بەفیرۆدا تا بزانم تێگەیشتنی هەموو شتێك پێویست نی یە.

### ٧٥٥- جان کۆکتۆ

ژیان کەوتنە خوارەوەیەکی ئاسۆیی یە.

### ٧٥٦- فران لەبویتس

کاتێك مرۆڤ خەوی لێ ناکەوێ.ژیان گوزەراندن تەنها کارێکە لەدەستی بێ.

### ٧٥٧- میریام مارگویس

ژیان ئەگەر قەڵەوبی. وەکو گۆرەپانی مینە کە دەبێ بەووریایی تیایدا هەنگاو بنێی دەنا پێتدا دەقێتەوە.

### ٧٥٨- کریستۆفەر مورلی

ژیان زمانێکی بێگانەیە کە هەموو ئادەمیزادەکان بەگوتنێکی هەڵە قسەی پێدەکەن.

### ٧٥٩- L.H مینکن

لەهەموو شتێکدا یەکسان. ژیانیش زۆر پێویست نیە: زۆرجار درێژە زۆر دەکێشێت.

### ٧٦٠- دسمۆند مۆریس

ژیان بەتێڕوانینێکی کورت لەدوکانێکی فرۆشتنی یاری منداڵان دەچێ لەماوەی نێوان لەدایکبوون و مردن.

### ٧٦١- نەناسراو: گرافیتۆری میترۆی لەندەن

ژیان نەخۆشیەکی پەتایی یە لەڕێگەی نزیك کەوتنەوە دەگوێزرێتەوە.

## ٧٦٢- هارۆڵد نیکلسۆن

یەکێك لەسەرگەرمیە بچووکەکانی ژیانێکی کورت تەوەزلی یە.

## ٧٦٣- ئۆسکار وایلد

ژیان زۆر زۆر گرنگترە لەوەی کە دەربارەی ئەو جدی قسە بکەین.

## ٧٦٤- کارۆلین ویلز

دەبێ بژی وفێر بیت، بەڵام بەداخەوە کاتێك فێر بوین ئیتر دەرفەتێکمان نیە بۆ ژیان بەسەر بردن.

## ٧٦٥- سیدین .j. هاریس

هەرکاتێك دەبیستم کەسێك بەپەژارەوە دەڵێت:" ژیان سەختە". حەز دەکەم لەو بپرسم: " بەبەراوورد لەگەڵ چی ؟".

## ٧٦٦- ئەدلی ستیڤنسۆن

جوان کەسێکە کە سەرنجتان ڕادەکێشێ. دڵ فریودەر کەسێکە کە تێڕوانینتان ڕادەکێشێت.

## ٧٦٧- ئۆسکار وایلد

ئەم ژنە لەهەموو شتێکدا تاوسێکی دیارە تەنها لەجوانیدا نەبێ.

## ٧٦٨- ماوریس ئیدڵمان

من حەزم لە سانسۆر نیە چونکە وەکو نەخۆشی ئاپاندیسە کە ئەگەر کاریگەر نەبێ بێ سوودە وئەگەر کاریگەر بێ مەترسیدارە.

## ٧٦٩- ئالان بنت

من تەواو لایەنگری ئازادی ڕادەربڕینم بەمەرجێ بەتوندی لەژێر چاودێریدا بێ.

## ٧٧٠- لاورنس .j. پیتەر

سانسۆر چی کەسێکە کە ئەوشتانەی دەیزانێ بەڕای ئەو نابێ تۆ بزانیت.

## ٧٧١- جۆرج برناردشۆ

مرۆڤ کوشتن شێوازی کۆتایی سانسۆرە.

## ٧٧٢- پاول گودمان

هەرکاتێك کەسانسۆری ڕەسمی هەبوو نیشانەی ئەوەیە کەڕەوشی ئازادی ڕادەر بڕین خراپە و هەرکاتێ سانسۆر لەئارادا نەبێ بەدڵنیاییەوە هەموو بڵندگۆکان بەدەستی قسەکەرانی ڕەسمی یە وەیە.

## ٧٧٣- واڵت ویتمان

خراپترین کتێب. کتێبێکە پاکتاو کراو.

## ٧٧٤- ستیڤن سپیندەر

دەترسم نەتوانم قسەرێکی باش ڕەخنە لێ بگرم. چونکە هەر ئێستا کتێبێکم خوێندەوە دەیووت: "گەلێك کەسانی بلیمەت لەقسەی خۆش و گاڵتە جاری بێ بەهرەن".

## ٧٧٥- پات نۆمالی

ووتاربێژی وەکو منداڵ لەدڵ پەروەراندنی ئاسانە و لەدایکبونی گرانە.

## ٧٧٦- د.L.بیدەر

مێشك بەڕاستی شتێکی سەیرە. لەوکاتەی کە دێتە دونیاوە تا ئەو ساتەی کە بۆ ووتاربێژی لەجێ ی خۆت هەڵدەسیت لەکار ناکەوێت.

## ٧٧٧- لۆرد بیرکت

بەوکەسانەی کەلەکاتی ووتاربێژیدا سەیری کاتژمێرەکەیان دەکەن ڕەخنەیەکم نیە بەڵام بەوەی کەکاتژمێرەکەیان دەجولێنن تا لەکارکردنیان دڵنیا بن بەتوندی ناڕازیم.

## ٧٧٨- مارك توین

ئامادەکردنی هەر ووتاربێژیەکی دەست بەجێ نزیکەی سێ هەفتە کاتم دەکوژێت.

## ٧٧٩- ساموئیل جۆنسۆن

کەسێك دەبێ هەبێ کە درزی نێوان پیتە بێ بەهاکان وسەری نێزەکان پڕ بکاتەوە.

## ٧٨٠- فری لویس دیلۆن

( شاعرونوسەری مەزهەبی ئیسپانیایی )

( لەکاتی ووتنی ووتاربێژیەکەی لەزانکۆی سالامانکا لەساڵی (١٥٧٧)، دوای بەسەربردنی پێنج ساڵ زیندان)

دوێنێ دەمانویست بڵێین کە...

## ٧٨١- هەنری کلای

ئەلکساندەر سیمس ! تۆ بۆ نەوەی نوێ قسەدەکەیت. کاکە، بەڵام من بۆ نەوەی ئایندە.

هەنری کلای: وادیارە بڕیارت داوە هەتا هاتنی بیسەرانت هەروا قسە بکەیت.

## ٧٨٢- ستيڤن ليكۆك

زۆربەی خەڵك دوای دەخولەك لەگوێ گرتن لەووتاربێژی ماندوو دەبن. کەسانی هۆشمەند دەتوانن لەمە زیاتر بڕۆن ولەماوەی پێنج خولەك ماندوو بن وبەڵام کەسانی تێگەیشتوو هەرگیز ئامادەنابن لە کۆڕی ووتاربێژیدا.

## ٧٨٣- گۆرڤیداڵ

پێم خۆشە کە شتە بەڵگەنەویستەکان بەشێوازێ دەخەیتە ڕوو کە وەك بڵێی داهێنانێکی گەورەت کردووە.

## ٧٨٤- جۆرج برناردشۆ

گەوجەکان هەمیشە لایەنگری نایەکسانی بوون( چونکە تەنها شانسی پەرەسەندنیانە)وکەسانی بەڕاستی گەورەش پشتیوانی یەکسانی.

## ٧٨٥- H.D. لاورنس

بەڕاستی کەبورژوا جانەوەرێکی سەیرە. بەتایبەتی ڕەگەزی نێرینەیان.

## ٧٨٦- H.W.ئۆدین

ڕوخسارم وەکو کێکی شایی یە کە لەژێر باراندا مابێتەوە.

## ٧٨٧- بیل بریسۆن

لەڕوخساری ئەو بابایە دەکرێ بەگاڵتە جاری پەروەردگار پەی ببەیت.

## ٧٨٨- ئۆسکار وایلد

تەنها کەسانی ڕووکەشن کە لەڕووی ڕواڵەتەوە داوەری ناکەن.

## ٧٨٩- باوکی روحانی سیدنی سیمس

جارجارە تیشکێك لەبێدەنگی ووتەکانی دڵنشین دەکرد.

## ٧٩٠- كریستینا ڕۆستی

بێدەنگی لەهەموو ئاوازێك خۆش ئاوازترە.

## ٧٩١- هەنری.J. كایزەر

كاتێك پۆستەكەت بۆخۆی قسە دەكات تۆ زۆر قسە مەكە.

## ٧٩٢- ئۆسكار وایلد

ئەولە ڕووی دەروونناسیەوە بەووردی دەیزانی كەی هیچ نەڵێت.

## ٧٩٣- وابەستە بە: ڕۆبەرت پنچلی

( گۆڕی هەڵكەنراو پێشنارێك بۆ یەكێك لە ئەستێرەناوزڕاوەكانی سینەما)

سەرەنجام بەتەنیایی نووست.

## ٧٩٤- دوروتی پاركەر

( سەنگی هەڵكۆڵراو پێشنیاریێ بۆ گۆڕەكەی خۆی)

ئەی خاك بمبەخشە.

## ٧٩٥- جۆرج برناردشۆ

وەڵامدانەوەی هیچ پرسیارێك دژوارترنیە لە پرسیارێك كە وەڵامەكەی دیارە

## ٧٩٦- ئەلبێر كامۆ

دەزانی دڵرفێنی یانی چی ؟. یانی وەرگرتنی وەڵامێكی باش بەبێ پرسینی پرسیارێكی دیار.

## ٧٩٧- نەناسراو

– حاخام، سوسیالیزم دەكرێ لەیەك وڵاتدا دابمەزرێنی؟.

– بەڵێ. كورم. بەڵام دەبێ خۆت لەوڵاتێكی تر دا بژیت.

## ٧٩٨- ئیرڵ وارن

زۆرێك لەهاوڵاتیان، ئەوکارانەی کە دەوڵەت بۆخۆی ئەنجامی دەدات بە پێشکەوتنی کۆمەلایەتی دەزانن. بەڵام بەوکارانەی کە بۆ ئەوانی تر دەیکات پەیوەستی دەکەن بەسۆسیالیزمەوە.

## ٧٩٩- دیان ئاچسۆن، سیاسە تمەداری ئەمریکی ١٩٧٠.

یەکەمین مەرجی سیاسەتمەداربوون دەبەنگ بوونە. گەیشتن بەو قۆناغە هەمیشە کارێکی ئاسان نی یە.

## ٨٠٠- هێربەرت ئیسکویت

وەزارەتی جەنگ سێ ئامار و ژمارەی هەبوو: یەکێك بۆ فریودانی هاوڵاتیان یەکێك بۆ گومڕا کردنی دەسەڵاتدارانی دەوڵەت و سێ یەمی بۆ هەڵخەڵەتاندنی خۆت.

## ٨٠١- ئەدلی ستیڤنسۆن

باشترین هۆکارێك کە بۆ پاڵاوتن بۆ سەرۆك کۆماری ئەمریکا دێتە بیرم ئەوەیە کە دەبێ ڕۆژی دووجار ڕیش تەراش بکەم.

## ٨٠٢- وابەستە بە : E.F سمیس

وینستۆن چەرچڵ. خۆشترین ساڵانی ژیانی تەرخانکرد بۆ ئامادەکردنی روتاربێژی یە بەڵگەنەویستەکانی.

## ٨٠٣- J.P. ئۆرۆرك

سیاسەت وەکو ڕەحمەتی بێ کۆتایی پەروەردگار دواین ڕێگە چارەیە.

## ٨٠٤- جۆن ئۆکۆنۆر

قاترەکانی سیاسەت: نەشانازی یەك بەپێشینە، نەئومێدێك بەپاشماوە.

## ٨٠٥- A.R بوتلەر

لەسیاسەتدا دەبێ هەمەیشە لەگەڵ مەڕەکان هەنگاو بنێ ی. چونکە هەر کە سستیت نیشان داو دەرکەوت بریندار بووی. گورگەکانی تر هێرش دێننە سەرت.

## ٨٠٦- ماوریس بارە

سیاسەتمەدار بەندەبازێکە کە هاوسەنگی بە ووتن، بەپێچەوانەی ئەوەی ئەنجامی دەدات دەپارێزێت.

## ٨٠٧- هیوودبرۆن

لیبراڵ کەسێکە کە هێشتا شەڕ دەستی پێنەکردووە ژوورەکەی بەجێ دەهێڵێ.

## ٨٠٨- هیلەر بلاك

تەرمی سیاسەتمەدار لەوێ
بەشکۆ و دەسەلاتی خەندەدار کەوتبوو
ئاشناکانی هەموو گاڵتەئامێز نەفرەتیان دەکرد
بەلام من لەگۆشەیەکدا دەگریام:
چونکە ساڵەهای ساڵ ئارەزووی بەدارهەڵواسینی بووم.

## ٨٠٩- ئەنومرین بیڤان

چەرچڵ بەشێوەیە باس لەشکستەکەی دەکات کە گوایە شکستەکەی ئەو ویستی پەروەردگار بووە.بەلام وەها باسی سەرکەوتنەکەی دەکات کە گوایە خۆی بەخشیویەتی بەخۆی.

## ٨١٠- وابەستە بە: ئەنوەرین بیڤان

بۆبەدست هێنانی پۆستی وەزارەت دوو ڕێگە زیاتر نابینرێت یان خۆش سەماکردن یان جووتە هەڵدان.

## ٨١١- پاپا پیوسی حەوتەم

( ئاماژە بەهەوڵدان بۆ گەیشتن بە ڕێککەوتن لەگەڵ ناپلیۆن)

ئێمە ئامادەین تا دەروازەی جەهەنم پێشکەوین بەڵام لەوە بەرەو پێشتر نە.

## ٨١٢- وینستۆن چەرچڵ

پرسیار: تایبەتمەندی پێویستی پیاوێکی گەنج کە بیەوێ ببێ بەسیاسەتمەدار چی یە؟.

وینستۆن چەرچڵ : توانای پێشبینی ئەوەی کەسبەینێ وهەفتەی ئایندەو مانگی ئایندەو ساڵێکی تر چی دێتە پێشەوە. وپاشان توانای ئاراستەکردنی ئەوەی کە بۆچی ئەم پێشبینیانە ڕووی نەدا.

## ٨١٣- وینستۆن چەرچڵ

من هیچ ڕێگەیەك بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوی جیهانی. ئەویش لەماوەی پێنج شەش ڕۆژ دروست نابینم. پەروەردگاری مەزنیش پێویستی بەحەوت ڕۆژ بوو.

## ٨١٤- بنجامین دیزریلی

ئەوەی کە بیروڕای گشتی ناودەنێین بە ئاسایی هەست وسۆزی گشتی یە.

### ٨١٥- ویل ڕۆجەرس

ژمارەی کەسانێك کە لەنێوان شەو وڕۆژێکدا هەڵبژێردران زیاترە لە کەسانێك کەلەنێوان شەوو ڕۆژێکدا دەنگیان هێنا.

### ٨١٦- ویل ڕۆجەرس

هەرچەندێ دەربارەی سیاسەت زیاتر بیر بکەیتەوە. باشتر بۆت دەردەکەوێت کە پارتەکان یەك لەیەك خراپترن.

### ٨١٧- فرانکلین.D.ڕۆزفلت

( دەربارەی سۆموزا. سەرۆك كۆماری نیکاراگوا. ١٩٣٨)

ئەم پیاوە حەرامزادەش بێ. حەرامزادەی خۆمانە.

### ٨١٨- جۆرج برناردشۆ

هیچ شتێك نازانێ.بەڵام پێ ی وایە هەموو شتێ دەزانێ. ئەمە خۆی نیشانەیەکی دیارە لەکاری سیاسی ئەو.

### ٨١٩- جۆرج برناردشۆ

ئاژاوەگێڕی جۆرێ یاری یە کەلەوکاتەدا پۆلیس دەتوانێ کوتەکت بدات.

### ٨٢٠- ڕۆبەرت فرۆست

لەگەنجێتی هەرگیز نەمدەویست ڕادیکاڵ بم. تالە ڕۆژانی پیری پارێزگاران دەرنەچم.

### ٨٢١- ڕۆبەرت فرۆست

پیاوی لیبراڵ تێڕوانینی لەوەبڵندترە کەلە شەڕدا بداتە پاڵ لایەنگرانی خۆی.

### ٨٢٢- فۆسیۆن

دیمۆستین: ئەی فۆسیۆن ئەگەر ئەنتینیەکان تورە بن تۆدەکوژن.

فۆسیۆن: وەئەگەر عەقڵیان بێتەوە سەرخۆ تۆ دەکوژن.

### ٨٢٣- تۆماس کارلایل

دەسەلاتدارێکی گاڵتەجاڕ ووتوویەتی بەئامار وژمارە هەموو شتێك دەکرێ بسەلمێت.

### ٨٢٤- کلاود کۆکبون

لەشەڕ و شۆڕدا خاڵی گرنگ هەمیشە ئەوەیە کە بۆ لایەنگرانی خۆتی بسەلمێنی کە دوژمن خۆی بەستوە بۆ داگیرکردنی خاك و مەڕومالاتی ئێوە یان درەوشانەوەی بازاڕی ئێوە بەپارچەی ئاوریشمی هەرزان قیمەتی خۆی دەشکێنێت و بەدەر لە ئەمانە بوونەوەرێکی شەڕاوی و بەووتەی ئێرلەندیەکان( دوژمنی خوایە).

### ٨٢٥- E.E. کۆمینگز

سیاسەتمەدار گوێ درێژێکە کە جگە لە ئینسان هەموو شتێ سواری پشتی بووە.

### ٨٢٦- ئالان کلارك

لەسیاسەتدا دۆستی ڕاستەقینە پەیدا نابێت. هەموومان پیدڵ لێدان وەکو کۆسە چاوەڕوانین تا ڕێچکەی خوێنین پەیدا بێ.

### ٨٢٧- جۆن.F کەنەدی

کاتێك دەسەلاتمان گرتە دەست ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانم بوو. ئەوە بوو کە بینم هەلومەرج بەهەمان خراپیە کە پێشتر دەمانگوت.

## ٨٢٨- جۆ كوينان

سەيركە لەولاتی ئێمە(ئەمريكا) كۆماری بەدەستی چ كەسانێكەوە بووە: ئەندرۆ جۆنسۆن، يەك مەيخۆری بێ ڕەوشت، وارن هاردينگ، ئەويش مەيخۆرێكی بێ رەوشت و لەدوايدا جيرالد فۆرد كە بۆ ئەدگاری بوونی پێويستی بەمەيخواردن نەبوو.

## ٨٢٩- لۆرد كيلمۆر

قەدر دانی لەتايبەتمەنديە ئاساييەكانی ژيانی سياسی نی يە.

## ٨٣٠- گلين گريفيتس

ئێمەناتوانين لەبەر ئەم هەموو گرفتەی ئەمڕۆی بەرتانيا سەرزەنشتی ويلسون بكەين. ئەو زيانانەی كە ئەو لەولاتی داوە بەتەنها كاری كەسێك نی يە.

## ٨٣١- باری گولدوەتەر

" هيوبەرت هامفری" ئەوەندە بەخێرايی قسەدەكات كە گوێ گرتن لە قەسەكانی وەكو ئەوەيە كە ئەودەمەی خێزانەكەت گۆڤاری " پلەی بۆی" هەلدەداتەوە.

## ٨٣٢- L.H مينكن

سياسەتمەداری باش هەر ئەوەندە پێشبينی ناكرێت كەوەك چەتەيەكی شەرافەتمەند.

## ٨٣٣- فيلد مارشال لۆرد مۆنتگۆمەری

من زۆربەی تەمەنم بەشەڕكردن لەگەل ئەلمانيا و سياسەتمەدارەكان بەهەدەردا،دەبێ بلێم جەنگ لەگەل ئەلمانيا پی ٚ بەپێ ئاسانترە.

## ٨٣٤- نەناسراو

لەناوشۆڕشدا گوڵاوبەسەر ڕووی کەسێکدا ناپرژێنن.

## ٨٣٥- فردریك نیچە

سیاسەتمەدار ئینسان بەدووچین دابەش دەکات: ئامێرەکان ودوژمنان.

## ٨٣٦- ئالان واتکینز

( دەربارەی ولیام وایت لاو لەکۆنگرەی پارتی پارێزگاران)

ئەو وەکو گیانلەبەرێکی زۆر پیر کەلە جەنگەڵ یان بێشە دا لە بۆسەدا بێ.
لەوێ دانیشتوە وچاوەگەورە وغەمبارەکانی بەدوای دوژمن جارێ بەم لاو وجارێك بەولادا دەسوڕاند و لەهەمان کاتدا لەگەڵ خۆی بیری دەکردەوە کە جێگەکە چۆڵ بکات یان هەستێت بەهێرشێکی بەرامبەر.

## ٨٣٧- پاوڵ ڤالیری

سیاسەت هونەری ڕاگراتنی هاوڵاتیانە لەبەشداری کردن لەکاروبارێکدا کە بەڕاستی پەیوەندی بەخۆیانەوەیە.

## ٨٣٨- پیتەر دی ڤریس

سیاسەتمەدار کەسێکە کە باشتر لەهەر کەسێك بەکەمترین ووشە زۆرترین قسەزانی دەکات.

## ٨٣٩- دوك ولینگتۆن

( لەکاتی بینینی نوێنەرانی یەکەمین ئەنجومەنی ڕیفۆرمخوان)

لەهەموو تەمەنم ئەم هەموو کڵاوە ناشرین و لاروخوارانەم نەدیبوو.

## ٨٤٠- گۆرڤیداڵ

ئەگەر دەتەوێ لەئەمریکا لەجیهانی سیاسەتدا پێشبکەوێ.تەنها لەدەوری یەک بابەتدا نابێ بخولێیتەوە ئەویش سیاسەتە.

## ٨٤١- نێردراو : .L. هاریس

سیاسەت بەکەڵکی ئەوانە دێت کەزیاتر لەبیری خۆیاندان،کەمتر لەبیری ئەوانی تردان و لەبیری ڕاستگۆیی هەرگیز!.

## ٨٤٢- ئیدوارد ستریتەر

بەخششی سەفەر لەچیدایە ؟. ٩٠٪ بۆچون وحەز و ئارەزووی پێش ئەوە و ١٠٪ بەتازەبوونەوەی بیرەوەریەکانی.

## ٨٤٣- ڕۆبەرت پنچلی

سەفەرکردن دووجۆرە: پلەیەک ولەگەڵ منداڵان.

## ٨٤٤- ئارت بوخڤاڵد

پەیداکردنی هاوسەفەر ئاسانترە تا قوتار بوون لەدەستی هاوسەفەر.

## ٨٤٥- ساچل پاچ

فرۆکە ڕەنگە تۆ بە کوشت بدات. بەپێچەوانەی ئەگەری ئەوەی بریندارتان بکات کەمترە.

## ٨٤٦- سامونیل جۆنسۆن

سواربوونی کەشتی وەک ئەوەیە لەزیندان بیت سەرباری ئەگەری خنکان.

## ٨٤٧- K.G. چستەر تۆن

دەڵێن سەفەر بیری مرۆڤ دەکاتەوە. ئەمە ڕاستە. بەڵام سەرەتا دەبێ بیرت لێ کردبێتەوە.

## ٨٤٨- چارلی چاپلین

هەموو ئەوشتانەی کە بۆ دروستکردنی کۆمیدیەك پێویستم پێیەتی بریتی

یەلە:

پارکێك، پۆلیسێك وکچێکی جوان.

## ٨٤٩-جۆن لۆك گۆدار

جۆرج فرانژۆ: فیلم دەبیّ سەرەتا وناوەرۆك وکۆتایی هەبێت.

جان لۆك گۆدار : بەدڵنیایی یەوە، بەڵام نەك بەزۆر ئاوا بێت.

## ٨٥٠-ئەنتۆنی نیولی ولیسلی بریکۆس

(ناوی فیلم میوزیکاڵ)

ئای دونیا ئاگاداربە ! دەمەویّ دابەزم.

## ٨٥١- والتەر باجوت

خۆشحاڵی گەورەی ژیان ئەنجامدانی کارێکە کە بە ووتەی خەڵکی لەتونای

تۆ دانیە.

## ٨٥٢- نێردراو: A.V شارپ

جۆشدان وەکو بێشکەی منداڵی وایە. بەردەوام تۆ دەجولێنیّ بەڵام ناگاتە

هیچ جێگەیەك.

## ٨٥٣- میڤیس گالانت

لەم دونیایە. بیروڕای زۆر هەیە وبەلای کەمەوە نیوەی ئەوانە کەسانێك

دەریانبڕیوە کە غەم وپەژارەیان نەبووە.

## ٨٥٤- ماتیوئارنۆڵد

شعر لەقولایی خۆیدا ڕەخنەیە لەژیان.

**٨٥٥- پوئیلوارد**

زمان،شیعری هەڵکۆڵراوە.

**٨٥٦- S.T ئیلیوت**

شاعری بێ ئەزموون لاسایی دەکاتەوەو شاعری بەئەزموون دزی.

**٨٥٧- K.G چیستەر تۆن**

شاعیران بەشێوازێکی نهێنی بەخش لەبارەی پەنیرەوە بێدەنگیان هەڵبژاردووە.

**٨٥٨- رۆبەرت فرۆست**

من شیعری ئازاد بەهەمان خێرایەك دەڵێم کە تێنس بەدابەزینی تۆڕەکە یاری پێ دەکەم.

**٨٥٩- مولەر**

هەر ئەوەی پەخشان نی یە هۆنراوەیە،وهەر ئەوەی هۆنراوە نیە پەخشانە.

**٨٦٠- مولەر**

مستەر جۆردان: چی ؟ ئەگەر بڵێم : نیکۆل. کڵاوی شەوم پێ بدە و بڕۆ نەعلەکانم بێنە، ئەمە پەخشانە؟.

مامۆستای فەلسەفە: بەڵێ.کاکە.

مستەر جۆردان: زۆر سەیرە ! . کەواتە من چل ساڵ و بەڵکو زیاتر لەگەڵ پەخشان قسەم کردووە وخۆم نەمزانیوە.

**٨٦١- ئەدریان میشێل**

هۆکاری گرنگی پێ نەدانی زۆربەی خەڵك بەزۆربەی شیعرەکان ئەوەیە کە زۆربەی شیعرەکان بۆ زۆربەی خەڵك بێ پەرۆشین.

## ٨٦٢- هۆراس

هەموو شیعرە بێ نرخەکان لەهەست و سۆزی واقعی یەوە سەرچاوە دەگرێت.

## ٨٦٣- بۆب براون

لەپشتی سەری هەر پیاوێکی سەرکەوتوو سالەها شکست هەیە.

## ٨٦٥- سامویل بیکت

( سامویل بیکت لەکاتی پرۆڤەی ئەکتەران لەشانۆی رۆیال کۆرت بەئەکتەرێك کە بە نالەوهاوار ووتبووی:" من سەرکەوتوو نەبووم". وتی :" زۆرباشە. بەردەوام بە. دوبارە شکست بخۆ. بەلام هەوڵ بدە جارێکی تر باشتر شکست بهێنی.

## ٨٦٦- ئەمبروس پێرس

سەرکەوتوویی گوناهێکی نەبەخشراوە کە دەرحەقی هاوکارەکانمان دوچاری دەبین.

## ٨٦٧- پیروس

(پاشا ئەپیرۆس دوای سەرکەوتنی بەسەر رۆمەکاندا بەبەهانەی لەدەسدانی زۆربەی سەربازەکانی :"

– بەسەرکەوتنێکی تر وەکو ئەمە کارمان تەواوە !.

## ٨٦٨- هێربەرت بایارد سۆپ

بۆ سەرکەوتن ناتوانم بەتۆ کارنامە بدەم.بەلام گەر ئەتەوێ. کارنامەی شکست ئەمەیە" بەشێوەیە رەفتار بکە کە هەموو لەتۆ رازی بن.

### ٨٦٩- .S. فردريك

كاتێك هەموو ڕێگاكان گەیشتنە بن بەست خۆت بەدەستەوە بدە.

### ٨٧٠- نویل كاوارد

سەركەوتن وەكو ماری مێینە منی لەباوەش گرتووە.

### ٨٧١- دینیس كۆفی

من ناكامێكی سەدەی بیستم: زگوردێكی كەم هەوەس وخۆشحاڵ.

### ٨٧٢- جان كۆكتۆ

ئاشكرایە كەمن بڕوام بەبەخت ونێوچاوان هەیە وگەرنە،چۆن سەركەوتنی كەسانێك كە لێیان وەڕسم ئاراستە دەكەم.

### ٨٧٣- لۆلیا دوشیزوێست منستەر

هەر كەسێك كە دوای تەمەنی سی ساڵی بینیت سواری پاس بوو بەكەسانی سەرنەكەتووی لەقەم بدە.

### ٨٧٤- L.H. مینكن

مەسەلەكە بەڕواڵەت لەوەدایە كە هەر كەسێك لەبەر ئەوەی كەسەرنەكەوتووە لەدەستەی بەندەكانی خودا دەژمێردرێت بەڵام هەركە سەركەوتوو بوو دەكەوێتە باوەشی شەیتانەوە.

### ٨٧٥- جۆن مۆرتیمۆر

بۆ شكست خواردن هەمیشە دەرفەتێك ماوە.

### ٨٧٦- دوایت مۆرۆ

دونیا پڕە لەكەسانێك كە كاردەكەن و كەسانێك كە بەرهەمی كارەكان بەناوی ئەوانەوە تەواو دەبێ.هەوڵبدە لەدەستەی گروپی یەكەمدا بیت چونكە ڕقابەی كەمترە.

## ٨٧٧- شيفەردوميد

( ناونيشانی كتێب)

نيشانەی سەركەوتنێك بەبێ ماندوێتی لەبازارگانيدا.

## ٨٧٨- ئۆسكار وايلد

سەركەوتوويی وەكو زانستە.ئەگەر مەرجەكانت هەبێ بەئەنجام ئەگەيت.

## ٨٧٩- گۆرڤيدالْ

هەركاتێك هاورِێ يەك سەركەوتنێك بەدەست دێنێت. شتێكی بچووك لەمندا دەمرێت.

## ٨٨٠- گۆرڤيدالْ

سەركەوتنی تۆ بەس نی يە. شكستی ئەوانی تريش پێويستە.

## ٨٨١- لۆرد بايرون

جۆرێك بێ باوەرِی يەخەگيرم بووە كە بەهيچ شێوەيە ناتوانم خۆم لەچنگی رِزگار بكەم.

لەووتەيەك: هيچ شتێك رِەت ناكەمەوە بەلاّم لەهەموو شتێك گومانم هەيە.

## ٨٨٣- نيلزبۆر

( كاتێك لێيان پرسی: ئايا بەرِاستی باوەرِت هەيە كە كوتانی نالّی ئەسپ لەسەر دەرگای مالّەوە

شانس وبەخت دێنێ؟.:

- باوەرِ ناكەم. بەلاّم دەلّێن ئەگەر برِوات پێی نەبێ كارناكات!.

## ٨٨٤- تەلموود( كۆمەلّی ياسای شەرعی وباوی جولەكە )

سێ شت بەكەمی باشە:- زۆر خراپ، هەوير،خوێ وگومان.

## ٨٨٥- وابەستە بەسام گۆڵدوین

وەلامی من بۆ ئێوە لەو ئەگەرە سەلمێنەرانەیە.

## ٨٨٦- مەلیکە ڤیکتۆریا

دەمەوێ بەجدی وریات بکەمەوە بەدوای دۆزینەوەی هۆکار و ڕونکردنەوەی هەموو شتێك نەکەویت. گەڕان وپەی بردن بەهۆکاری هەر شتێك کارێکی مەترسیدارە کە جگە لە نائومێدی و بێبەشی ئەنجامێکی نابێت و دەرەنجام مرۆڤ پەرێشان وبەدبەخت دەکات.

## ٨٨٧- ئۆسکار وایلد

شك کردن دەسپێکی بیروباوەڕە.

## ٨٨٨- ڕۆنی بارکەر

خاڵی سەرنج ڕاکێش سەبارەت بە نوکتەی دوولایەن ئەوەیە کە تەنیا یەك مانای هەیە.

## ٨٨٩- جۆن باچان

بەبێ ڕووخۆشی دوکانێکی ئاومیوە گێری ناتوانی ببەی بەرێوە. چ جای وڵاتێك.

## ٨٩٠- ڤیکتۆر بۆرگ

کورتترین ماوەی نێوان دووکەس پێکەنینە.

## ٨٩١- میل برۆکس

رووخۆشی بەڕاستی یەکێکە لەڕێگاکانی بەرگری کردن لەخۆت لەبەرامبەر ئەم دونیا غەددارە.

## ٨٩٢- ئالان بنت

ئەم قسەی منت لەبیر بێ. کاتێك گەورەکان بۆ دەربڕینی ڕووخۆشی پەنایان بۆ تەوالێت دەبرد. ئەمە خۆی ڕاگەیاندنی کارەساتە.

## ٨٩٣- ساموئیل جۆنسۆن

لەژیاندا، هەرکەسێك جار جار لەدڵی خۆیدا دەڵێ: شەڵامنیش گاڵتە چی بوایەم.

## ٨٩٤- بیت دیڤیس

پشتوێنی سەلامەتی ببەستە. شەوێکی ناخۆش لەپێشمانە.

## ٨٩٥- نێردراو: جۆن بیگس دیڤیسون

نۆبەکار: باوکی پیرۆز، هەتا کوێ دەبێ لەگەڵ کچێکدا بڕۆیت؟.

قەشە: تا هەرکوێ ئارەزووت لێ یە. کوڕم، بەمەرجێ کە هەروەها لەڕۆیشتن بەردەوام بیت.

## ٨٩٦- ویل ڕۆجەرس

هەموو شتێ تا ئەوکاتە کە بۆ ئەوانی تر ڕوودەدات،گاڵتە وسەیرانە.

## ٨٩٧- جۆزێف کۆنراد

کاریکاتێر دانانی ڕوخساری گاڵتەئامێزە لەسەر پەیکەری ڕاستێتی.

## ٨٩٨- گۆڤاری پانچ

وەرە سەیر کەین، گارسۆن: ئەگەر ئەمە قاوەیە. من چایم دەوێ وئەگەر چایی هەیە قاوەم بۆ بێنە.

## ٨٩٩- ئەریك مۆركاب وئەرنی وایز

ئەرنی: بۆچی دەموچاوت ناشۆیت؟. من بەدەموچاوتا تێدەگەم كە ئەمڕۆ چیت خواردووە !.

ئەریك : باشە، ئەگەر ڕاست دەكەی. بڵێ.

ئەرنی: سوسیس وهێلكەی مریشك بەدۆشاوی تەماتەوە.

ئەریك:بینیت هەڵەت كرد؟ئەمانەی كە ووتت دوێنێ خواردوومە.

## ٩٠٠-رۆدی ڤالی

كچ:چەند رۆژ پێش ئێستا بینیم كەلەسەر پێچكردنەوەی جادەكە چاوت لە كچەكان دادەگرت.

پیاو: چاوم دانەگرت،لەسەر ئەو پێچە، بایەكی توند دێت، شتێك كەوتە چاوم.

كچ: ڕاستە. پاشانیش چووە ناوئوتومبیلەكەت!.

## ٩٠١- هاری هرشفیلد

– ئێستا نزیكەی ساڵ و نیوێكە كە كچەكەم دەبینی. كەواتە مەبەستتان شەرافەتمەندانەیە یان ناشەرافەتمەندایە؟

– یانی دەتوانم هەلبژێرم؟.

## ٩٠٢- وابەستەبە : ئەلیك ئیسیگوینس

( دەربارەی بێ مەیلی بەكاری هەرەوەزی)

وشتر ئەسپێكە كە بەشێوەی ئەنجومەن نەخشەسازی كراوە.

## ٩٠٣- رۆبەرت کۆپیلاند

بۆ ئەوەی ئەنجومەنێك بتوانێ کارێك ئەنجام بدات دەبێ ژمارەیان لە سێ کەس تێپەرنەکات و لەو ژمارەیەش دوو کەس ئامادە نەبن.

## ٩٠٤- نەشناڵ لامپون ١٩٧٩

مێردەکان: دەستەیەکی کەم لەپیاوانی چەکدار بەجانتایەك پارە هەستان بەگەمارۆدانی دەستەیەك پێکهاتوو لەژن و منداڵێك.

## ٩٠٥- ئۆسکار وایلد

پیاوان کاتێك مێردێکی باشن زۆر پەژارە هێنەرن وکاتێك مێردێکی باش نین بەشێوازێکی بێزارکەر لەخۆڕازی وخۆبەزل زانن.

## ٩٠٦- فرید ئالن

ئەستێرەی ناسراو کەسێکە کە تەمەنێك بۆ ناوداربوون کۆشش دەکات و کاتێك ناوداربوو عەینەکی رەش لەچاو دەکات تا کەسێ نەیناسێت.

## ٩٠٧- جیری رۆبین

من بەناوبانگم.کاری من ئەوەیە.

## ٩٠٨- فران لبویتس

باشترین ناوبانگ.ناوبانگی نووسەرانە. چونکە هەر ئەوەندەیە کەلەچێشتخانەیەکی باش مێزێکتان بۆ چۆڵ بکەن بەڵام ئەوەندەنا کەلەکاتی نان خواردن بینە سەریەشەتان.

## ٩٠٩- ئۆسکار وایلد

لەدونیا شتێك خراپترە لەوەی کە خەڵکی دەربارەی کەسێك قسە بکەن و ئەویش ئەوەیە کە دەربارەی کەس قسە نەکەن.

## ٩١٠- جۆرج برناردشۆ

ڕاستگۆ بوون مەترسیدارە مەگەر ئەوەی گێل بیت.

## ٩١١- ئۆسكار وایڵد

ڕاستگۆیی. كەمێ مەترسیدارەو زۆریشی سەد لەسەد كوشندە.

## ٩١٢- جۆرج برناردشۆ

پیاوێكی تۆزێ بەشەرەف وژنێكی تۆزێ وەفادار كە هەردووكیان بزانی ونەزانی مەی خۆرن و لەماڵێكی تۆزێ پاك دەژین.ئەمەیە وێنای واقعی خێزانێكی ئاست مامناوەند.

## ٩١٣- جۆرج برناردشۆ

دەبێ لەپێناوی ئەوانی تر بژیم نەك بۆ خۆم. ئەمەیە ڕەفتاری ئاست مامناوەند.

## ٩١٤- مارك

من بەجیاوازی چینایەتی بڕوام نیە. خۆشبەختانە خزمەتكارەكەم لەگەڵ مندا هاوبیروڕا نی یە.

## ٩١٥- وودی ئالن

سەرەتا دوودڵ بوین كە مۆڵەت وەربگرین وبڕۆین بۆگەشت یان ئەوەی كە تەڵاق وەربگرین. بەباشی كەبیرمان كردەوە زانیمان كە گەشتی بەرمۆدا دوو هەفتە زیاتر ناخایەنێت. لەكاتێكدا كە تەڵاق هەمیشە بۆ ئینسان دەمێنێتەوە.

## ٩١٦- وابەستەبە: جۆنی کارسۆن

جیاوازی نێوان تەلاق و وازهێنانی یاسایی ئەوەیە کە سەبارەت بەدووەمی

پیاو دەرفەتی شاردنەوەی پارەکانی هەیە.

## ٩١٧- جۆن کینت گالبرێت

خۆشترین کاتی ژیانی ئادەمیزاد یەکسەر دوای یەکەم تەلاقە.

## ٩١٨- نێردراو: تۆماس ئە پریل

( کاتێك لەناو فرۆکە بەگرۆچومارکس یان ووت : ئەگەر خاتوونەکان بێزار

نەکەیت دەتوانی جگەرە بکێشیت لەولامدا ووتی :"

ئەگەر مافی ئەوەم هەیە خۆم هەڵیبژێرم. دەردیسەری بۆ ژنان بەلەپێشتر

دەزانم.

## ٩١٩- جیوڤینالْ

چەند دژوارە پلارنەنوسین.

## ٩٢٠- جۆناتان سویفت

توانج ئاوێنەیەکە کە بینەران ڕوخساری هەرکەسێکی تیا دەبینن جگە لە

ڕوخساری خۆیان.

## ٩٢١- ڕیچارد برینسلی شریدان

لیدی سنۆولْ " گاڵتەجاری بەبێ هۆیەك بەخراپەکاری نابێت, تەلەکەبازی

وەکو دڕکێکە دەبێتە هۆی پێوەلکانی.

## ٩٢٢- ولیام شکسپیر

سەرنج بدە چۆن کاتژمێرێك گاڵتەجاڕی سازددات تابەزویی لێدان دەست

پێ بکات.

## ٩٢٣- جیمس مەك نیل ویسلەر

ئۆسکار وایلْد : چەندە دلْم دەیویست ئەم قسەیە من بیکەم.

ویسلەر:دەیکەی،ئۆسکار، دەیکەی.

## ٩٢٤- چارلْس براکیت و بیلی ویلدەر

نینچکا: بۆچی دەبێ سندوقی کەسانی تر هەلْبگریت؟.

پۆرتەر: باشە.ئەمە ئیشمە.خاتوون.

نینچکا: ئەمە ئیش نیە.ناعەدالەتی کۆمەلأیەتی یە.

پۆرتەر: پەیوەندی بەبەخشی یەوە هەیە.

## ٩٢٥- ماری ئەبنێرڤان ئشنباخ

بەڕۆماتیزم وعەشقی ڕاستەقینە باوەڕناکەم. مەگەر دوای یەکەم هێرشی ئەوان.

## ٩٢٦- هیوودبراون

توانای عەشق دەربڕینی هەرزەکارانە تایبەتمەندیەکی باوە، کە ئادەمیزاد لەئاژەلْەکان جیادەکاتەوە.

## ٩٢٧- سامۆیل جۆنسۆن

عەشق حیکمەتی گەوجەکان و دیوانەیی عاقلْەکانە.

## ٩٢٨- دۆگلاس جیرۆلْد

عەشق وەکو سورێژەیە.هەرچی درەنگتر تووشی ئینسان بێت خراپترە.

## ٩٢٩- سومەرست موام

جیّ ی خەوتن دەلّیّ ی؟ ئەگەر خۆشەویستی لەئارادا نەبێ هیچ ژنێك نرخی شایەکی نیە. بەلأم کاتێك خۆشەویستی هەبێ. هەرچی لەبەر پیّ ی بڕێژی کەمە.

## ٩٣٠- چارلز دیکنز

لەدڵی مرۆڤدا دەزوو هەیە.. هەرئەوەندە باشە کە ئەم دەزوانە نەلەرێنەوە.

## ٩٣١- لۆرد دیوار

خۆشەویستی دەیاریەکە لەهەست وسۆز کەلە هەموو لایەکەوە خەرجی

دیاریکراوە.

## ٩٣٢- جۆن ساکلینگ

خۆشەویستی وەکو بایەکە

خۆی بەدڵەوە دەناڵێنیّ

ئەگەر رێگری بکەی خۆت ئازاردەدەی.

وەئەگەر وازی لیّ بینی کەسانی تر ئازاردەدات.

## ٩٣٣- چارلز سیدلی

ئەو دەتخەڵەتێنیّ

من باوەڕدەکەم

خۆشەویستان لەمەزیاتر چیان دەویّ ؟

## ٩٣٤- نیکولاس سباستیان چامفرت

خۆشەویستی بەشێوەیەك کە ئەمڕۆ لە کۆمەڵگەی ئێمەدا هەیە، شتێك نیە

مەگەر گۆڕینەوەی دووگومان و بەریەك کەوتنی ڕوکەشی دوو جەستە.

## ٩٣٥- ولیام شکسپیر

ئۆڤیلیا: کورتە، سەروەرم.

هاملێت : هەروەك خۆشەویستی ژنان.

**٩٣٦- ویندی کوپ**

دڵی من بیری خۆی کردوەتەوە

ولەبەختی خراپی تۆ هەڵهاتووە.

**٩٣٧- O.W مان**

ماچکردن شیرینترین شێوازە بۆ سەلماندنی ئەم ووتەیە کە دوومێوژ باشترە

لەیەك خورما.

**٩٣٨- ڕوز مەکالی**

خۆشەویستی نەخۆشیەکە. بەڵام دەرمان دەکرێت.

**٩٣٩- L.H مینکن**

خۆشەویستی گومانێکە کە گوایە لە ژنێکەوە بۆ ژنێکی تر جیاوازی هەیە.

**٩٤٠- L.H مینکن**

خۆشەویستی وەکو جەنگە. دەسپێکردنی ئاسانەو کۆتایی هێنانی گرانە.

**٩٤١- نانسی میتفۆرد**

خۆشەویستی وەکو نەخۆشی. کاتێك دووچاری مرۆڤ دەبێ کەئامادەیی تیا

هەبێ.

**٩٤٢- وابەستە بە: می ویست**

خۆشەویستی بەسەرهەموو شتێکدا زاڵ دەبێ، مەگەر بێ پارەیی وددان

ئێشە.

**٩٤٣- فردریك نیچە**

ئەوکاتە مرۆڤ عاشق دەبێ لەهەمو کاتێك زیاتر ئازار دەچێژێ وپەنا بۆ

هەموو شتێك دەبات.

## ٨٤٤- ئەنتۆڵ فرانس

هەڵەکانی هەست و سۆز بەسەر بێ پەرۆشی عەقڵ و ئاواز پێش دەخەم.

## ٩٤٥- بنجامین فرانکلین

دانا کێ یە ؟ ئەو کەسەی لەهەموو فێر دەبێت.

بەتوانا کێ یە؟ ئەوەی بەسەر هەست و سۆزی فەرمانڕەوایە.

دارا کێ یە؟ ئەوەی ڕازی بوون دەکات بەپیشە.

کەسێکی وا لە کوێ یە ؟ لە هیچ کوێ.

## ٩٤٦- E.G لیسینگ

کەسێك کە برێك لە ئیشی عەقڵ لەدەست نەدات، ئاوەزێکی نیە لە دەستی بدات.

## ٩٤٧- جۆن هۆڵمز

ئێستاکە کەسێك لەقسەکانتان نارازی نیە، نابێتە بەڵگەی ژیری ودانایی تۆ. بەچی دیارە کەتۆ سەرۆك نیت؟

## ٩٤٨- ئەلبێرت ئەنشتاین

لەدیدی منەوە هاوکێشە گرنگترە، چونکە سیاسەت بۆ ئێستایە و هاوکێشە بۆ هەتا هەتایە.

## ٩٤٩- ئەلبێرت ئەنشتاین

کاتێك ئینسان لەگەڵ ژنێکی جران دانیشتووە بەلایەوە کاتژمێرێك یەك خولەکە، بەڵام ئەگەر لەسەر بوخاریەکی گەرم دابنیشێت یەك خولەك بەلایەوە درێژ ترە لەهەرکاتژمێرێك. رێژەیی یانی ئەوە.

## ٩٥٠- بيل بريسۆن

وەرن لەگەڵ یەکتردا ڕاستکۆبین. ڕۆڵی ئیتالیایەکان لەتەکنۆلۆژیا بەداهێنانی فڕنی پیتزا دروستکردن کۆتایی هات.

## ٩٥١- بەرتراند ڕاسل

هەرچەند پێ دەچێت کەئەمە هاودژیەك بێت،ناخی زانست لەژێر کۆنترۆڵی بیری ڕێژەیدایە،کاتێك کەسێك پێت دەڵێ کە ئەو ڕاستی تەواو دەزانێ دەربارەی هەرشتێك،پارێزراوی لەوەی کەئەوکەسێکی بەدیقەت نی یە.

## ٩٥٢- جۆرج برناردشۆ

زانست تەنها کاتێك مەترسیدار دەبێ کە پێی وابێ بەئامانجی خۆی گەیشتوە.

## ٩٥٣- ئارتۆر .C.کلارك

ئەگەر زانایەکی بەساڵاچوو ناسراو بڵێت فلان شت ڕەنگە. بەئەگەری نزیك بە دڵنیایی یەوە ڕاست بڵێ بەڵام ئەگەر بڵێت شتێ ناکرێ، بەئەگەری زیاد هەڵە دەکات.

## ٩٥٤- میلس کینگتۆن

شێوازێك کە گژوگیاناسان بۆ دابەشکردنی گوڵەکان بەکاری دەهێنن، یادی سیاسەتمەدارەکانم دەکەوێتەوە وبەوەی کە چۆن ئەفریقایان بەوڵاتانی جیاجیا دابەشکرد.

## ٩٥٥- فران لبویتز

زانایان، گرانە بتوانین لەڕیزی کەسانی خۆش ڕەفتار دابنێین. ئەم کۆمەڵەیە لەمیواندارییەکان دەست و پێی خۆیان وون دەکەن.لەگەڵ غەریبەکان خۆیان

به غەریب دەزانن.لەگاڵتەجاری کورت دێنن و ئیتر چارەیەکیان نیە جگە لەوەی خۆیان بەخوێندنەوەی ووردی شتەکانی ڕۆژانە سەرگەرم بکەن.

### ٩٥٦- ستیڤن لیکۆك

ئەو دوو چارە واقعی یەی ئەنشتاین دەستی داوەتێ. ئەو بوو کەساڵی ١٩٠٥ ڕایگەیاند کە شتێك بەناوی سرەوت یان هێمنی ڕەها بوونی نیە. لەوکاتە بەدوا هەر وای لێهات.

### ٩٥٧- E.A هاوسمان

چۆنە کە تەنها لە زانایان و کەسانی زانستخواز پێشبینی دەکرێ کە حەز و ئارەزوو لەخۆیان نیشان بدەن.

### ٩٥٨- پیتەر یۆستینۆف

ترسی من لەداهاتوویەکە کەلە ژێر دەسەڵاتی کۆمپیوتەرەکان بێت و کۆمپیوتەرەکان ئەو پرسیارانە ئاراستە بکەن کەتەنها خۆیان توانای وەڵامدانەوەیان هەبێت.

### ٩٥٩- تۆماس باکۆن

کاتێك شەراب دێتە ژورێ. ئاوەز دەچێتە دەرەوە.

### ٩٦٠- کۆڵ پۆرتەر

( دوای گەمارۆدانی لە گۆرەپانی ئەسپ سواری لەساڵی ١٩٢٧)

چیتر سەلمێنرا کەپەنجا ملیۆن فەرنسی بەهەڵەدانەچوون کە لەبری سوار بوونی ئەسپ گۆشتەکەی دەخۆن.

## ٩٦١- سنكا

جێگەی سەرسورمان نیە کەئەم هەموو نەخۆشی یە لەدنیا هەیە. سەیرکەن چەندێ چێشت لێنەر هەیە !.

## ٩٦٢- کلیفتۆن فیدمان

پەنیر جولێنەری شیرە بەرەو نەمری !.

## ٩٦٣- دیڤید گاریك

پەروەردگار گۆشتی بەتام بۆ ئێمە دەنێرێت و شەیتان چێشت لێنەر.

## ٩٦٤- سۆمەرست موام

خەڵکی زیاتر لەولایەنەوە سکی برسیەکان تێردەکەن کەشتێ نەبێتە دەردیسەری چێژوەرگرتنیان لەخواردنەبەتامەکان.

## ٩٦٥- ڕونالد نۆکس

ناڕەزایی من بۆ ئاو بەهۆی چێژیەوە نیە، بەڵکو لەبەر کاریگەریەکانی دوای ئەوەیە.

## ٩٦٦- باوکی ڕوحانی A.W سپونەر

ناوت بەباشی لەبیرمە بەڵام دەمووچاوت هەرگیز نایەتەوە یادم.

## ٩٦٧- ئەلبیرت هوبارد

بیرکردنەوەی بەتوانا ڕەنگە شتێکی باش بێت. بەڵام نیشانەی ڕاستەقینەی گەورەیی بەتوانایی لەبیرکردنە.

## ٩٦٨- نێردراو: M. تورپین

میراتی شتێکە کە کاتێك منداڵێکی بیر تیژت هەیە بڕوات پێ یەتی.

## ٩٦٩- كلارنس دراو

نیوەی سەرەتای ژیانمان باوك و دایكمان تێكی دەدەن ونیوەی كەماوە منداڵەكانمان.

## ٩٧٠- ئەن لاندرس

ئەگەر دەتەوێ منداڵەكانت گوێ بگرن. بەهێواشی لەگەڵ یەكێكی كە قسەبكە.

## ٩٧١- L.L هەندرین

بەڵگەی ئەوەی باوكەكان كوڕەكانیان دەنێرن بۆ زانكۆ لەوە زیاتر نی یە كە خۆیان یان بە زانكۆ ڕۆیشتون یان نەڕۆیشتون.

## ٩٧٢- H.F برادلی

كاتێك هەموو شتێك خراپە. خراپترین بناسین باشە.

## ٩٧٣- جۆرج سانتیانا

لەدایكبون ومردن بێ چارەسەرە. كەواتە دەبێ ماوەی نێوان ئەم دووانە بەدەستكەوت بزانین.

## ٩٧٤- پەندی ئیتالیایی

خانووەكە كەسووتا.هیچ نەبێ خۆمان گەرم بكەینەوە.

## ٩٧٥- پەندی جولەكە

ئەگەرناتوانی گاز بگری ددانت دەرمەخە.

## ٩٧٦- فلان ئۆبراین.

بەبڕوای من هەتا دنیا دنیا بێ. مرۆڤەكان فەرهەنگی ووشە چاپ دەكەن. هەتا شتە نادیارەكان بەچەند ووشەیەك بەهەمان ئەندازەی نادیار پێناسە بكەن.

## ٩٧٧- جۆن براون

بوونەوەرێکی زۆر سەیرن ئەم نوسەرانەی فەرهەنگی ووشە.

## ٩٧٨- ریچارد..W بەیلی

فەرهەنگە گەورەکان شتێك نین جگە لە کۆگاکانی هەڵکەندراو بە مێخی بێ کەڵك و گەرد گرتوو.

## ٩٧٩- سامۆیل جۆنسۆن

واژەدانەر: فەرهەنگ نووس یان زەحمەتکێشی بێ ئازار.

## ٩٨٠- سامۆیل جۆنسۆن

دڵتەنگ بوون: فەرهەنگ نووسین کارێکی دڵتەنگ کەرە.

## ٩٨١- ئۆلیڤەر گۆڵد سمیس

لەگەڵ( سامۆیل جۆنسۆن) مشتو مڕ ناکرێ. گریمان کە دەمانجەکەی هەڵە بکات.

## ٩٨٢- راڵف والدوئیمرسۆن

ئاڵفی هەرێز چی یە؟ گیایەك کە سوودەکانی هێشتا نەدۆزراوەتەوە.

## ٩٨٣- وینستۆن چەرچڵ

ئەو هەموو باشیەك کەمن لێی بێزار بووم هەیبوو هیچ یەکێك لەو نزم و نەوییانەی کە پێم باش بوو نەیبوو.

## ٩٨٤- جۆناتان سویفت

لەجیهاندا هیچ شتێ جێگیر نی یە جگە لە ناجێگری.

## ٩٨٥- وليام شكسپير

ئەگەر لەخو ورەفتاری خۆم بەئابڕوو نیم. بەهەرحاڵ جار جار بەڕێککەوت وام لێدێت.

## ٩٨٦- بیلی گراهام

لەهەر کەسێکدا شتێکی کەم لە پێوەری ڕەوانی دەتوانین بەدی بکەین.

## ٩٨٧- واڵت وتیمان

من لەخراپیدا هاوشانی خراپترینەکانم، سوپاس بۆ خوا، لەباشیشدا لە ئاستی باشترینەکانم.

## ٩٨٨- ئفرابن

دوور بکەوەوە هەژاری پەتایە.

## ٩٨٩- ویلم دی کۆنینگ

کەموکوڕی هەژاری ئەوەیە کە هەموو کاتێ مرۆڤ دەکوژێت.

## ٩٩٠- جۆرج برناردشۆ

بەلایەك گەورەتر و تاوانێك ناشیرنتر لەهەژاری نی یە.. یەکەم ئەرکی ئێمە ئەرکێك کە هەموو تێبنیی یەکانی تر دەبێ بکەینە قوربانی،ئەوەیە هەژار نەبین.

## ٩٩١- جۆرج برناردشۆ

گرفتی هەژاران دەستکورتی و گرفتی دەوڵەمەندەکان بێ سوودی یە.

## ٩٩٢- ولیام شکسپیر

سەروەرم. من لەدەست کورتی هاوشانی ئەیوبم بەلام نەك لەسەبوری.

## ٩٩٣- پەندی هندی

لەکەسێکی برسی بپرسی دوو وە دوو. دەڵێت چوار گونك نان.

## ٩٩٤- جۆن لۆبوك

دەڵێن جارێکیان ژنێکی بێنەوای دانیشتووی مانچستەریان برد بۆ قەراغی دەریایەك وئەوکە یەکەمجار بوو چاوی بەدەریاکە کەوت بەخۆشحاڵیەوە ووتی :

" سوپاس بۆ خوا کەئەم یەکە بۆ هەمووانە.

## ٩٩٥- نەناسراو

خانەنشینی واتا مێرد لێکدانی (٢) ودرامەد دابەش بەسەر (٢).

## ٩٩٦- نەناسراو

هەژاران منداڵیان زۆرە و دەوڵەمەندەکان خزم و کەسوکار.

## ٩٩٧- ئۆسکار وایلد

پارەیەك لەماڵمدا نیە.. بەهەفتەیەك بەچەند فرانکێك لە ڕۆژێکدا دەژیم یان وەك دەژیم.. منیش وەکو رێزدار سنت فرانسیس ئاسیسی خۆشەویست لەگەڵ هەژاریدا پەیمانی هاوسەرێتیم بەستووە. بەجیاوازی ئەوەی من لەم هاوسەرگیریە سەرکەوتوو نەبووم.

## ٩٩٨- فرانك مەك کینی هوبارد

هەژار بوون مایەی شەرمەزاری نیە. گەرچی دەتوانیٚ ببیٚ.

## ٩٩٩- بەرتراند ڕاسل

ترس لە خۆشەویستی یانی ترس لەژیان و ئەوانەی کەلەژیان لە ترسدان ڕۆژ بە ڕۆژ سیٚ لەچواری لەشیان مردووە.

## ١٠٠٠- بەرتراند راسل

لەنێوان جۆرەها تێبینی ڕەنگە تێبینی کردن لەخۆشەویستیدا لەناوبەرترین شتە لەخۆشبەختیدا.

## ١٠٠١- نەناسراو

یەك شت هەیە کەلەهەموو سوپاکانی دونیا بەهێزترە وئەویش بیرکردنەوەیەکە، کەکاتی هاتووە.

## ١٠٠٢- ئۆلیڤەر ئیدواردس

منیش بە پێی دەرفەتی خۆم هەوڵم داوە ببمە فەیلەسوف بەڵام چی بڵێم من کە چالاکی وسەربزێویم بەردەوام ڕێگری ئەوکارە بووە.

## ١٠٠٣- تۆم ستۆپارد

تامەتایی بیرێکی مەترسیدارە. مەبەستم ئەوەیە کە کۆتاییەکەی بەرەو کوێ تەواو دەبێ ؟.

## ١٠٠٤- تۆم ستۆپارد

ئەگەر عەقلانی بوون ڕەوایی بوونی شتەکان دەبوو.دنیا پێك دەهات لە کێڵگەیەکی زۆر گەورە لە سویا.

## ١٠٠٥- تۆم ستۆپارد

( لەبارەی هەڵبژاردنی لق لەزانکۆ)

نزیکەی هەمور ئەوکەسانەی کەلە کارەکانی خۆیان سەرسام مابونەوە.فەلسەفەیان هەڵبژارد و دیارە ئەمە مەنتقی یە.

## ١٠٠٦- بەرتراند ڕاسل

ئەرستۆ پێی وابوو ژمارەی ددانەکانی ژن کەمترە لەددانەکانی پیاو. ئەو دوو جار ژنی هێنا هیچ جارێك بۆی ڕێك نەکەوت کەبە تاقیکردنەوەی دەمی ژنەکانی بەڕاستێتی بۆچوونەکەی خۆی بکات.

## ١٠٠٧- سوقرات

( لەکاتی بینینی بڕێکی زۆر لە کەلووپەلی فرۆشتن)

ئای، چەندێ شتومەك کەمن بەبێ ئەوانە دەتوانم تێپەڕیم!.

## ١٠٠٨- ولیام شکسپیر

هیچ فەیلەسوفێك تا ئێستا نەیتوانیوە ددان ئێشە بەئۆقرەیی بەرگە بگرێت.

## ١٠٠٩- L.H. مینکن

لە مێژووی مرۆڤایەتی نیشانەیەك لەفەیلەسوفێکی شادمان نادۆزیتەوە.

## ١٠١٠- دوروتی پارکەر

تەنها خواستێك کەلە هۆلیوودا هەیە دزی کردنە.

## ١٠١١- جۆرج برناردشۆ

گرفتی. مستەر گۆلدوین لەودایە کە تۆ تەنها بیر لەهونەر دەکەیتەوە ومن تەنها پارە.

## ١٠١٢- ولیام فادیمان

هۆلیوود لەباکوورو باشوور و رۆژهەلات و ڕۆژئاوا بەدەلالەکان دەورە گیراوە.

## ١٠١٣- تۆنی کرتیس

( کاتێك لێی دەپرسن: ماچکردنی "مارلین مۆنرۆ" چۆنە؟)

وەكو ماچكردنی هیتلەرە.

**١٠١٤- وابەستەبە : سام گۆڵدوین**

ئەوەی ئێمە دەمانەوێت چیرۆكێكە لەگەڵ بورمەلەرزە دەست پێ بكات، لەبەردەوامبوونی بگاتە خاڵی لوتكە.

**١٠١٥- وابەستە بە : مۆس هارت**

( دەربارەی هۆلیوود)

جوانترین شوێنی كۆیلەكان لەجیهان!.

**١٠١٦- ئالفرێد هیچكۆك**

( كاتێ " ماری ئەندرسون" لەهیچكوكی پرسی : چی لایەك "ی بۆ وێنەگرتن گونجاوەترە).

لەسەری دانیشتی ئازیزەكەم.

**١٠١٧- هووارد هیوس ( كوڕ)**

ئەم پیاوە ( كلارك گیبل) بەو دوو گوێچكەیەوە وەكو تەكسی یەكە دوو دەرگای كرابێتەوە.

**١٠١٨- جۆن ئاربۆتنات**

یاسا چاڵێكە بێ كۆتایی.

**١٠١٩- چارلز دیكنز**

مستەر بامبل ووتی :" ئەگەر یاسا وادەڵێت، یاسا گەوجە، یاسا كەرە".

**١٠٢٠- سیسرون**

یاسا لەكاتی جەنگدا خۆی بێدەنگ دەكات.

### ١٠٢١- هەنری کیسنجەر

بۆ ئێمە کاری نایاسایی وەکو ئاوخواردنەوەیە. شتێك کەکات دەبات کاری دژ بەیاسای بنەرەتی یە.

### ١٠٢٢- نێردراو : مایکڵ هینز

کەسانی زیرەك یاسا ناشکێنن، تەنها کەمێ دەیچەمێننەوە.

### ١٠٢٣- مارك توین

### ١٠٢٤- مەلیکە ئەلیزابێسی یەکەم

( بانگەوازی ڕابەرانی شورا کە دژ بە ڕەفتاری ئەو لەگەڵ ماری کوئین بوون.)

ئێوە ناچار دەکەم سەردانەوێنن.

### ١٠٢٥- ئالفرێد هیچکوك

تەلەفزیۆن کوشتن و تاوانی گەڕاندوەتەوە نێومالّەکان،یانی بەشوێنی لەدایکبوونی بنچینەی ئەو.

### ١٠٢٦- لۆرد بایرون

دەسەلاّت مەیلی بەگەندەڵی هەیە و دەسەلاّتی ڕەها گەندەڵی ڕەها لەگەڵ خۆی دێنێت.

### ١٠٢٧- ولیام جۆنز

بەبڕوای من نابێ بڕوا بەدەسەلاّت بکرێت. لەدەستی هەرکەسێکدا بێت.

### ١٠٢٨- نۆرمان دوگلاس

بێ بڕوایی بەدەسەلاّت دەبێ لەسەرووی ئەرکە مەدەنی یەکانەوە بێت.

## ١٠٢٩- بەرتراند ڕاسل

بەدەر لەخۆشگوزەرانی، گەورەترین بزێوی مرۆڤەکان ڕێگری لەخۆشگوزەرانی کەسانی تر بەواتایەکی گشتی تر بەدەستهێنانی دەسەلاتە.

## ١٠٣٠- هەنری کیسنجەر

دەسەلات گەورەترین بزوێنەری هەوەسە.

## ١٠٣١- کاترین وایت هۆرن

منداڵەکان وزیپ بەزۆر چاك نابن.مەگەر هەندێ کات.

## ١٠٣٢- فردریك سایر

پەیمان دان ڕێکەوتنێکە کە تەنها بۆ لایەنی لاواز پێویستی جێ بەجێ کردنە.

## ١٠٣٣- لویس .B.مایلەر

بەلێنی زارەکی شتێکە کە نرخی کاغەزێکی نی یە کەلەسەری دەنوسیت.

## ١٠٣٤- میلز کینگتۆن

باوکم لەبارەی وەسڵەکانەوە دوو ئامۆژگاری کردوم،یەکەم هەمیشە دوودڵ بم تیایانداو هیچ کاتێك نەیدەمەوە مەگەر ئەوەی چارەیەکم نەبێ.

## ١٠٣٥- ئوسکار وایڵد

ئەم ڕۆژانە مرۆڤ دەبێ سەرقاڵی یەکی هەبێت. خودی خۆم ئەگەر قەرزم نەبێ بیرم لەچی دەکردەوە؟

## ١٠٣٦- جروم .K. جروم

مەحالە ئادەمیزاد لەوێڵ گەڕان چێژی تەواو وەربگرێ. مەگەر ئەوەی کاری زۆر بێ.

## ١٠٣٧- وینستۆن چەرچڵ

مستەر چەمبەرلاین زەحمەتکێشانی خۆشدەوێت. نازانی کەچەندێ لە کارکردنیا چێژوەردەگرێ.

## ١٠٣٨- بروس گروکۆت

ماوەیەکی زۆرە بەو دەرەنجامە گەیشتووم کە ئەگەر کار بەڕاستی شتێکی دڵگیر بوایە. دەوڵەمەندەکان زۆرترینیان بۆ خۆیان دەهێشتەوە.

## ١٠٣٩- ستیڤن لیکوك

پسپۆربوون شتێکە وکاربەدەست هێنان شتێکی تر.

## ١٠٤٠- جۆن مارشاڵ

( ژن. بانگەواز بۆهاوڕێکەی وبەئاماژە بەهاوسەرەکەی کە لەجۆلانەکە پاڵی دابووە.

سەرگەرمی " فرێد" ئەمەیە کە دەهێڵی باڵندەکان تەماشای بکەن.

## ١٠٤١- جۆرج وایتفیلد

داڕزان باشترە لە ژەنگ گرتن.

## ١٠٤٢- ڕۆبەرت .E ویلسون

بۆدەستپێکردنی ڕۆژ دەبێ ڕێگایەکی باشتر لە بێداری سەرلەبەیانی هەبێت

## ١٠٤٣- ئیدگار واتسون هاو

کەسێك کە بەڕاستی سەرگەرمی کارکردنە. هیچ کاتێك نازانێ کێشی چەندە.

## ١٠٤٤- جۆرجی پێنجەم

کتێبی پیرۆز. کتێبێکی سەرنج ڕاکێشە. بەڵام هەندێ بابەتی زۆر سەیرو سەمەرەیە.

## ١٠٤٥- ئۆسکار وایڵد

لۆرد ئیلینگ وورس : کتێبی ژیان بە چیرۆکی ژن و مێردێك لەباغێکدا دەست پێ دەکات.

خاتوو ئالۆن بی : وەبەدۆزینەوەکانی یوحەنا کۆتایی دێت.

## ١٠٤٦- لۆگان پیرسال سمیس

کتێبی پڕ فرۆش : ئارامگای بڵندی تواناکانی ناوەنجی.

## ١٠٤٧- سیدنی سمیس

لەنێو پێداویستیەکانی ماڵەوە شتێك جوانتر لە کتێب نی یە.

## ١٠٤٨- فلان ئۆبراین

لاپەرە (٩٦)بەکردەوە. ئەم لاپەرەیە ڕەمزی منە کەتیایدا ناوی خۆم دەنووسم تامەچەکی ئەمانەت گیرەکان وکتێب خۆرەکان بگرم.

## ١٠٤٩- فرانسیس باکۆن

هەندێ لە کتێبەکان دەبێ چەشە بکەی، هەندێ دەبێ قووت بدەی وهەندێکی تر دەبێ جوان بیجویت و هەرس بکەیت.

**١٠٥٠- دوروتی پارکەر**

ئەمە لەوکتێبانە نیە کە بەئاسانی لەگۆشەیەکدا دایبنێین. دەبێ بەهەموو هێز فرێیی بدەین.

**١٥١- مارك توین**

بەرهەمی کلاسیك: کتێبێك کە خەڵکی باسی لێوەدەکەن و نایخوێننەوە.

**١٠٥٢- میرڤین گریفت جۆنز**

( لەدادگا. لەبانگهێشتی ئەو. H. لارنس نوسەری کتێبی " عاشقی خاتوو چاترلی ")

ئایا حەزدەکەی ئەم کتێبە هاوسەرکەت یان خزمەتکارەکانتان بیخوێننەوە؟

**١٠٥٣- جان جاك ڕۆسۆ**

ڕقم لەکتێبە. کتێب تەنها ئەوە فێری ئێمەدەکات کەباس لەشتێك بکەین کە هیچی لێ نازانین.

**١٠٥٤- هەنری ڕید**

ئەم خاتوونە.بەوشێوەی کەمن ئەو دەناسم. بەدرێژایی شەو نەباسێك لەکتێبەکە دەکات و نەلەراستیدا لەهیچ شتێکی ناخۆشی تر.

**١٠٥٥- C.W.سلارو J.R یە تمان**

( سوپاسگوزاری نوسەرانی کتێب)

نوسەرانی ئەم کتێبە هەروا سوپاسی خێزانەکانیان دەکەن کە فەرهەنگۆکێکی هەڵەیان نەدابەدەستەوە. کتێب بێ فەرهەنگۆکە.

**١٠٥٦- وابەستە بە : جۆرج برناردشۆ**

فەرهەنگۆکی کتێب : هاوتایی یەکی گەورە.

## ١٠٥٧- ئەناتۆل فرانس

هیچ کاتێك کتێب بەئەمانەت مەدەبەکەسێك. چونکە هەرگیز نایگەڕێنێتەوە لە کتێبخانەکەی خۆمدا تەنها ئەوکتێبانە دەبینرێت کەکەسانی تر بەئامانەت پێیان داوم.

## ١٠٥٨- وابەستە بە : نوئل کۆوارد

"مەدام بۆڤاری " بەئارەزووبازترین کتێب دەکرێ ببینرێت. ئەم ژنە یەك ئارەزوبازە بەتەواوی مانا. گەرچی لەسەرتاسەری کتێبەکە یەك ووشەی نایاب نادۆزیتەوە.

## ١٠٥٩- کتێبی پیرۆزی. ئەیوب

ئای بریا.. نەیارەکەم کتێبێکی بنوسیایە !.

## ١٠٦٠- گرۆشۆمارکس

(پشت نوسی کتێبی تۆڵەسەندنی داون گینز بێرگ، نوسینی J.S پەرلەمان) لەوساتەوەی کە کتێبەکانم بەدەستەوە گرتووە تا ئەو کاتەی دامنا، هەروایەکسەرە پێدەکەنیم، دەبێ ڕۆژێك بیخوێنمەوە.

## ١٠٦١- نانسی میتفۆرد

لەتەمەنمدا تەنها کتێبیکم خوێندوەتەوە.ئەویش ددانی سپی بوو. ئەم کتێبە ئەوەندە باش بوو کە چیتر زەحمەتی خوێندنەوەی هیچ کتێبێك بەخۆم نادەم.

## ١٠٦٢- ئۆسکار وایلد

کتێبی ڕەوشتی وناڕەوشتیمان نیە. کتێب یان باش نووسراوە یان خراپ.

## ١٠٦٣-وابەستەبە : ئۆسكار وایڵد

لەسەردەمی کۆندا ئەدیبەکان کتێبیان دەنووسی و هەموو خەڵك دەیانخوێندەوە. ئەمڕۆ هەموو خەڵك کتێب دەنووسن و هەر کەسێك دەیانخوێنێتەوە.

## ١٠٦٤- J.P

کارتی پیرۆزبایی پێکەنیناوی بۆ جەژنی کریسمس وجەژنی لەدایکبوون نەنێرێت. ئەوانە بۆ مەراسیمی دڵنەوایی هەڵبگرە. چونکە لەوکاتەدا زیاتر پێویستیان بەشادی یە.

## ١٠٦٥- بایرون ڕۆجەرس

جەژنی کریسمس کاتێکە لەساڵدا کە ئادەمیزاد بەدوای خێزانەوە گرفتار دەبێ.

## ١٠٦٦- جۆرج بوش

مەگەر شورەیی یە ئینسان تەوەزەل بێ ؟

## ١٠٦٧- دیلان تۆماس

دیلان هەروا کە خێرا وخێراتر قسەی دەکرد. وەستا ووتی : کەسێك خەریکە حەوسەڵەم ناهێڵێ. پێم وایە خۆمم".

## ١٠٦٨- برت لیستۆن تایلۆر

ئینسانی تەوەزەل کەسێکە کە ئەگەر ئەحواڵی بپرسی بەتۆ دەڵێ چۆنە.

## ١٠٦٩- L.H مینکن

دیارە تواناکانی مرۆڤەکان بۆ تەوەزەلکردنی یەکتری لەهەر ئاژەڵێکی تر زۆرترە.هەندێ لەداهێنانە بەبەهاکانی ئەوان هیچ ئامانجێکی جگە لەمە نی

یە. لەوانە : میوانداری نان خواردن بۆ زیاتر لەدووکەس. دروشمی وورووژێنەر وزانستی سەرووی سروشت.

## ١٠٧٠- ئۆسکار وایلد

ئینگلیزەکان زۆر حەز دەکەن لەسەر مێزی بەیانیان بەئاگایی یەوە خۆیان نیشان بدەن. دیارە ئەمە مایەی ئابڕوو چونە ! چونکە تەنها کەسانی گێل لەسەر مێزی سەرلەبەیانی بزێو دەبن.

## ١٠٧١- جۆن ئۆپدیك

ڕوسیا تەنها وولاتی جیهانە کە مرۆڤ لەهەمان کاتی نیشتەجێ بوون تیایدا دوچاری غەمی دووری ولات دەبێ.

## ١٠٧٢- بەرتۆلت برشت

ئەندریا: بێچارەیە ئەو ولاتەی پالەوانی نی یە.

گالیلۆ: بێچارەیە ئەو ولاتەی کە پێویستی بە پالەوانە.

## ١٠٧٣- ئالان بنت

سوید : جێگەیەکە کە خەلکەکەی خۆیان دەکوژن وپادشا کەیان پاسکیل سواری.

## ١٠٧٤- سامۆیل جۆنسۆن

کەسێك کە ئیتالیای نەبینی بێ بەردەوام ئەو گرێ یە لەدلیدایە کەئەوەی دەبێ بیبینێ نەیبینوە.

## ١٠٧٥- نویل کۆدارد

( کاتێك لێیان پرسی: لەئوسترالیا چی شتێك فێربووی؟)

کەنگەر.

## ١٠٧٦- جيرمين گرير

ئوستراليا ماڵێكی گەورەی بەساڵاچوانە كە هیچ هەواڵێكی ناخۆش لەوێ لەسەر لاپەڕەی خراپترین ڕۆژنامەكانی جیهان نابینرێت.

## ١٠٧٧- ئۆزبێرت لانكاستەر

ئەگەر بڕیار بێ بێگانە بم ئەڵمانی بوون وسەرەتا پرووسیای بوون لەپێش هەمووی دادەنێم. بەڕاستی ئەگەر ئەڵمانیا لەڕووخۆشی بەهرەمەندن.كەم وزۆر لێهاتوویی ئەوەیان تیا بوو كەشەرەفی ئینگلیزی بوونیان پێ بدرێت.

## ١٠٧٨- كریستۆڤەر مۆرلی

نیۆیۆرك لووی تیرۆئیدی میللەتی ئەمریكایە.

## ١٠٧٩- مارگریت ماهی

كەنەدیەكان هەمان ئەمریكای یەكانن بەلاّم بەبێ دیزنی لاند.

## ١٠٨٠- ئیڤلین وا

من هەرگیز خۆشم لەنەرویجیەكان نایەت.لەوڵاتی ئەواندا هەتاو هەرگیز ئاوانابێ. مەیخانەكان هیچ كاتێك ناكرێنەوە وسەرتاپای وڵاتەكەیان بۆنی ماسی لێ دێت.

## ١٠٨١- جۆزیف هیلەر

وڵات. پارچە زەوی یەكە. كەلە هەموو لایەكەوە سنوری دیاریكراوە. سنورێكی دەستكرد.

## ١٠٨٢- ئادلی ستیڤنسون

مرۆڤ تەنها بەقسەكردن ناژی. وەك هەندێ جارناچار دەبێ قسەكەی قووت بدات.

## ١٠٨٣- لارند هاند

ووشەکان هەروەکو هەتاوپەرست ڕەنگی ژینگە دوبارە دەدرەوشێنێتەوە.

## ١٠٨٤- وابەستەبە : L.H مینکن

کلێسا جێگەیەکە پاکزادە بەرێزەکان کە هەرگیز پێیان بەبەهەشت نەگەیشتووە بۆ کەسانێك کە هەرگیز پێیان بەبەهەشت ناگات قسەی زۆر دەکەن.

## ١٠٨٥- هاری پۆلیت

( ئیسپنسەر لەوەلامی ستیڤن سپنسەر کەلە سالەکانی (١٩٣٠) لەوی پرسی بوو شاعر چۆن دەتوانێ خزمەتی ئامانجی کۆمۆنیستی بکات. ووتی : برۆ بۆ ئیسپانیا خۆت بەکوشت بدە. بزوتنەوە پێویستی بەبایرونێکی ترە.

## ١٠٨٦- گاری ترۆدۆ

دۆنزبری :.. بەڕاستی گالتەجارییە. چین وڕوسیا دوژمنی خوێنەخۆرەی یەکترن. چین هێرش دەکاتە سەر ڤێتنام. ڤێتنام پەلاماری کامبورج دەدات ڕوسیا بۆ ئەفغانستان لەشکرکێشی دەکات. بەم پێ یە. تەنها ئەو ولاتانەی کەکۆمۆنیستەکان لەم دوایانەدا پەلاماریاندان. ولاتی کۆمۆنیستی بوون!.
D.B – عەجەب دەبەنگی یەکە ئەوانە بۆ ئەوە هێرش دەکەنە سەریەکتر تاتواناى خۆیان بپارێزن.

## ١٠٨٧- ویل ڕۆجەرس

کۆمۆنیزم وەکو قەدەغەکردنی مەشروباتی ئەلکهولی یە. بیرۆکەیەکی باشە بەلام عەمەلی نیە.

## ١٠٨٨- كارڵ ماركس

من تەنها ئەوەدەزانم كە ماركسیزم نیم.

## ١٠٨٩- نەناسراو

كۆمۆنیست كەسێكە كەشتێكی لەسەر سفرە نیە، بەڵام دەیەوێ لەگەڵ هەموو خەڵكی دونیا بەشی بكات.

## ١٠٩٠- جیمس ثوشەر

هەموو لەچوار ساڵیدا بەكڵاوی كاغەزیەوەوبەسەر شمشێری تەختەوە لە ئاستی ژەنراڵیدان. شتێك كە هەیە ژمارەیەك لەئێمە هەرگیز لەوەگەورەتر نابین.

## ١٠٩١- گریسی ئالن

كاتێك لەدایكبووم ئەوەندە شڵەژام كەتابەیەك ساڵ ونیو توانای قسەكردنم نەبوو.

## ١٠٩٢- لان ئۆبلینگ هاوس

خێراترین ڕێگەیەك بۆ باوك یا دایك كەبیەوێ سەرنجی منداڵەی ڕابكێشێ ئەوەیە كەلەگۆشەیەكدا دابنشێ و هەناسەیەك بەئاسوودەیی هەڵبكێشێت.

## ١٠٩٣- J.P ئۆرۆرك

ئەو قسە فەرامۆشكراوەی كە ئێستاش هەر لەپۆلەكانی زانكۆ دوبارە دەبێتەوە. ئەكەمجار جان جاك رۆسۆ خستیە سەر زاران و ئەوەش ئەوەی ئینسانی ئاسایی لەمنداڵیەوە باشە. هەر كەسێك كەیەكەمجار لەتەمەنیدا منداڵێكی تازە پێ گرتووی بینیبێ. دەزانێت ئەم قسەیە چەندە وڕاوەیە.

### ١٠٩٤- ئیما بۆمبیك

تیۆریکی دەوونناسیم خوێندەوە کە دەڵێت:" هەرگیز لەکاتی تورە بووندا لەمنداڵەکەت مەدە". ! باشە. کەواتە بڵێ کەی منداڵەکەم کوتەك بدەم؟. ڕۆژی لەدایکبوونم کاتێك ماچم دەکات یان کاتێك تازە لەسەر تەختی نەخۆشی سورێژە هەستاوە؟. یان لەکاتی خوێندنەوەی کتێبی پیرۆز.

### ١٠٩٥- لۆرد بایرون

جێگەیەکی زۆر خۆش وئارامە ومنداڵەکانیش تەنها زۆر بەهێواشی هاوار دەکەن.

### ١٠٩٦- نێردراو : لیسلی پەیج

زۆربەی منداڵەکان لەهەڵکەندنی گوڵەکان خۆشحاڵن. دیارە زۆربەی لەڕەگەوە.

### ١٠٩٧- مارك توین

هۆگری وخووپێوەگرتن بێ ڕێزی بەباردێنێ. سەرباری منداڵ.

### ١٠٩٨- W.F جۆنز

لەپێشدا لەبەرئەوەی باوك و دایکەکان.منداڵەکانیان بەمەبەستی پەروەردەکردن کوتەك دەدا. ئەمڕۆش لەپێناوی بەرگری کردن لەخۆ.

### ١٠٩٩- نویل کۆوارد

( کاتێ لێیان پرسی لەسەردەمی منداڵی.چۆن منداڵێك بووە).

ئەوکاتەی بەردەوام بەباشی ئاگایان لەمن بوو خۆشەویست بووم. کاتێکیش بایەخیان بەمن نەدەدا بەتەواوی بەدرەفتاربووم.

## ١١٠٠- ئاليس رۆزفلت لانگ وورت

هەبونی منداڵی بچووك وەكو ئەوەیە كە مرۆڤـ پیانۆیەكی گەورە لەپەنجەرەیەكی بچووكی سەردەرگاكەوە بباتە دەرێ.

## ١١٠١- وابەستە بە: C.W فیلدز

لەهەموو ئەمریكا پیاوێك نادۆزیتەوە كەبەپەنهانی حەزی نەكرد بێ بسرەوێنێتە ئەژنۆی منداڵێك.

## ١١٠٢- سیمۆن گری

ستیڤن: بەڵگەی تۆ دژبەمنداڵبوون چی یە؟

سیمۆن : یەكەم جێگەم كەمە. دووەم منداڵەكان ژیانی دایك و باوك بۆگەن دەكەن. سێیەم پاشان ژیانی خۆیشیان بۆگەن پێ دەكەن و بەڵام چوارەم سوودی هێنانیان بۆ ئەم دونیای هەشت وحەوتە چی یە؟ پێنجەم وشەشەم وپێش هەموو شتێك حەزم لەمنداڵ نی یە. باشە؟.

## ١١٠٣- فران لبوتیز

تەنها لەكاتێك لەمنداڵەكەت بپرسە بۆنان خواردن حەزی لە چی یە كە پارەكەی خۆی بیدات.

## ١١٠٤- جاك لولین داڤیس

( سلڤیا. دایكی جاك لولین. كاتێك كوڕەكەی بینی ئەو هەموو كێك و چایەی خواردووە بەبیری هێنایەوەكە:" ئەگەر سبەی نەخۆش نەكەوتی !". وئەو لەوەڵامدا ووتی :" ئەگەر هەر ئەم شەونەخۆش نەكەوتم!.

## ١١٠٥- كاندیامەك ولیام

بەلەدایكبوونی هەر منداڵێك دوو ڕۆمان لەدەست دەدەیت.

### ١١٠٦- هارۆڵد .S. هۆلبرت

منداڵان پێویستیان بەسۆزوخۆشەویستی یە. بەتایبەت کاتێك کە شیاوی ئەوەنین.

### ١١٠٧- نێردراو : G.R هۆنت

کەسانێك کەدەیڵێن وەکو منداڵ ئارام دەنوون. ئاسایی یە منداڵیان نی یە.

### ١١٠٨- جۆزیف هیلەر

حەزدەکەم کە گەورە بووم.منداڵێکی بچکۆلەبم.

### ١١٠٩- مارك توین

ڕاستە کە ئێرە ئوتێلێکی باش بووە. بەڵام ئەوشتە ناسەلمێنێ. منیش سەردەمێك کوڕێکی باش بووم.

### ١١١٠- لویس کروڵ

بنەمانەوەیە: سبەی بەهەدەر بدە. دوێنێ بەهەدەر بدە. بەڵام ئەمڕۆ هەرگیز !.

### ١١١١- جۆن مینارد کینز

نازانم کامیان ئینسان زیاتر کۆنە پارێز دەکات :" بێ ئاگایی لەهەموو شت جگە لەئێستا یان بێ ئاگای لەهەموو شت جگەلە ڕابوردو".

### ١١١٢- فران لبویتز

دژە ووشەی قسەکردن. چاوەڕوان بوونە نەك بیستن.

### ١١١٣- نەناسراو

ئەگەر لەبارەی کەسانی ترەوەقسەبکەم دەڵێ ی قسەی پووچە. لەبارەی خۆمەوە قسەبکەم بێزارکەرە بەڵام ئەگەر لەبارەی تۆ قسە بکەم ئاخر زەمانە.

### ١١١٤- ئۆسكار وايلد

من لەقەسەكردن لەگەڵ ديوار زۆر خۆشحاڵم، چونكە لەهەموو دونيا ئەمە تەنيا شتێكە لەگەڵ من دژ نی يە.

### ١١١٥- ئۆسكار وايلد

ئەگەر دەمانتوانی بەئینگلیزی قسە بکەین وە ئیرلەندی یەکان فێری بیستن بکەین ئێستاکۆمەڵگایەکی لەمە باشترمان دەبوو.

### ١١١٦- هۆبەرت هۆمفری

مافی بیستنی قسەکانتان. بەهەند وەرگرتنیان ناگرێتەوە.

### ١١١٧- فرید ئالن

بێ دەنگ ئەی ووتەی دڵپەسەندی بچووک هاوارمەکە بەزوویی بە کوێرە دەستەواژەیەك دەگۆڕێیت.

### ١١١٨- تۆم ستوپارد

لێگەڕێ قەسەکانت شیرینی کوڕەکان بێت. ڕاستگۆیت دەوێ چی سوود !.

### ١١١٩- ڕۆڵف والدۆئیمرسون

پلەی یەکەم لەبەدەسهێنانی بێژەر، ووتەی دڵپەسەندەو پلەی دووەم بەدەستهێنانی یەکەمین گوێزەرەوەی ئەو.

### ١١٢٠- جێز ئەگێت

ئێستا ئیتر ستوونی کارەبایەکم کەهیچ پەخشان نووسێك لنگی بەسەرمندا بەرزناکاتەوە.

### ١١٢١- هسکت پیرسۆن

گێرانەوەی ووتەی نادروست لەڕاستیدا مایەی شانازی وسەرفرازی دانایانە.

مرۆڤی زۆر خوێنەر هەرگیز ووتەی دروست ناگێڕنەوە. ئەوەش بەو بەلگە روونەی کە زۆر خوێندویەتیەوە.

## ١١٢٢-O دوگلاس

من خەروارێك گێڕانەوەی قسەدەزانم. لەبەر ئەوە بەئاسانی دەتوانم دەربڕی دانایی خۆم بم.

## ١١٢٣- دوروتی.L سیرز

بۆ هەرشتێك گێڕانەوەی قسەیەکی حازر وئامادەم هەیە. لەبەر ئەوە لە لەبیرکردنەوەی واقعی بێ بەشم.

## ١١٢٤- جۆرج برناردشۆ

من زۆر جار قسەی خۆم دەگێڕمەوە.ئەم کارە نەرم و نیانی قسەکەم زیاتر دەکات.

## ١١٢٥- روودیارد کیپلینگ

ئەو وەکو گەدایەك کە جلی ئەرخەوانی ئیمپراتۆرەکان دەپۆشێ وخۆی لە بەرگی ووتەکانی گەورەکان دپێچێتەوە.

## ١١٢٦- جۆرج ئورۆیل

قەدیسەکان دەبێ بەردەوام بەگوناهکار بزانین. مەگەر ئەوەی کە بێگوناهیان بسەلمێنرێت.

## ١١٢٧- جۆزێف فیفەر

مەسیح لەبەر خاتری گوناهەکانی ئێمە گیانی بەخت کرد. چۆن دەتوانین بە گوناه نەکردن فیداکاریەکەی بێ نرخ بکەین؟

**١١٢٨- جۆن سپارۆ**

( گۆڕی هەڵکوڵکراوی مۆریس بورا)

بیٚ تۆ فیردەوسی بەرین کولبەی ئەحزانی منە

لەگەڵ تۆ دۆزەخ هەمووی باغی بەهەشتی منە

**١١٢٩- مایکل جۆنز**

( کێلی گۆڕی خەفتەتبارێکی بەناوبانگ)

نەمووت؟

**١١٣٠- C.W فیلدز**

( گۆڕی هەڵکەنراو. پێشنیارێك بۆخۆی)

لێرە من C.W فیلدز ئارامم گرتووە. بەباشی دەزانم لەفیلادڵفیا بژیم.

**١١٣١- ئیزاك باشڤیس سینگەر**

من لەپێناو سەلامەتی خۆم نیە بووم بەگیاخۆر، ئەم کارەم بۆ سەلامەتی مریشك وکەلەشێرەکان کرد.

**١١٣٢- کین دۆد**

ئێستا(١٨) مانگە کەلەگەڵ خەسووم قسەم نەکردووە. چونکە حەزناکەم خۆ هەڵقورتێنمە ناوەڕاستی قەسەکانی.

**١١٣٣- لیس داوسۆن**

خەزوورم پێی وایە من پیاو نیم. گرنگ نیە. چونکە بەڕاستی لەبەرامبەر ئەودا پیاو نیم.

## ١١٣٤- L.H مینكن

ویژدان. خەزوور ( یان خەسوو) یەكە كە پرسیار ولێپێچینەوەی كۆتایی نایەت.

## ١١٣٥- هیوبەرت هامفری

لەپشتی هەر پیاوێكی سەركەوتوو خەسوویەكی پەنجەلەدەم وەستاوە.

## ١١٣٦- چارڵز دیكنز

وەكو باج واقعی ودروستە و بەڕاستی هیچ شتێك لەباج واقعی تر نی یە.

## ١١٣٧- ویل رۆجەرس

ئەوەندە باج بەدەرامەتی ئەمریكیەكان درۆی كردووە یاری گۆڵف نەیكردووە.

## ١١٣٨- میلتۆن فریدمان

نرخ هەڵكشان جۆرە سەرانەیەكە بەبێ زەحمەتی یاسا دارشتنێك دەخرێتە ئەستوی خەڵك.

## ١١٣٩- بنجامین دیزرلی

هۆگۆ بۆهۆن دەیووت :

" مرۆڤی پەسەند لەلای من كەسێكە كە قسەكانی منی لەلاپەسەند بێ "

## ١١٤٠- رینگ لاردنەر

ڕوونی كردەوە ووتی :" بێ دەگ بە".

## ١١٤١- وابەستە بە : لۆرد سۆپەر

ئەنجومەنی پیرانیش بێ نرخ دانان نی یە.. هەر چی بێ بەڵگەیەكی زیندووی دوای مردنە.

## ١١٤٢- مۆرت سالّ

كۆنەپارێز کەسێکە بڕوای بە چاکسازی هەیە بەڵام نەک ئێستا.

## ١١٤٣- نەناسراو

کۆنەپارێز کەسێکە ستایشی ڕادیکاڵیەکان دەکات. دیارە سەدەیەک دوای مردنیان.

## ١١٤٤- جیمس لیڤەر

تایبەتمەندی جل و بەرگێکی ئستاندارد

دەساڵ پێش خۆی : قێزەوەن

پێنج ساڵ پێش خۆی: ئابڕووبەر

یەک ساڵ پێش خۆی : جوان بەڵام چاپوکانە

یەک ساڵ دوای خۆی : مۆدێلی نەماوە

دەساڵ دوای خۆی : ناشیرین

بیست ساڵ دوای خۆی : مایەی پێکەنین

سی ساڵ دوای خۆی : بەچێژ

پەنجا ساڵ دوای خۆی : کۆنەو جوان

حەفتا ساڵ دوای خۆی : فریوودەر

سەد ساڵ دوای خۆی : دیدەنی

سەدوپەنجا ساڵ دوای خۆی: جوان

## ١١٤٥- هەنریک ئیپسن

کاتێك بۆتیکۆشان لە ڕێگەی ئازادی وڕاستیدا لەماڵ دەردەچیت نابێ باشترین شەرواڵت بپۆشی.

## ١١٤٦- هاری ستانلی

لەهەر هەزار پیاودا یەکێکیان دەبێتە ڕابەری ئەوانی تر. ئەوانی تر هەمووی شوێن کەوتەی ژنانن.

## ١١٤٧- M.M نوین / نێردراو

پیاوی سەرکەوتوو، پیاوێکە کە دەرامەتی لەخەرجی هاوسەرەکەی زۆرتر بێت و ژنی سەرکەوتوو ژنێکە کە پیاوێکی وابەدەست بهێنێ.

## ١١٤٨- نێردراو : G.F بنسون

پیاوان بەسێ دەستە دابەش دەبن : بەژن ڕێك، هۆشیار، زۆرینە.

## ١١٤٩- .T. فولەر

کەسێك کە هەموو ئەوشتانەی کەدەزانێت بەژنەکەی دەڵێت : زۆرکەم دەزانێت.

## ١١٥٠- ساموێل جۆنسۆن

ئەگەر بیرکردنەوە نەبوایە پیاو لەباوەشی خزمەتکارێك هەر ئەوەندە هەستی بەبەختەوەری دەکرد کە وەك لەباوەشی خانەدانێکدا.

## ١١٥١- M ڤان دورن

من بەدوای پیاوێکدا دەگەڕێم کەتەنها میهربان و بەشعور بێت. تۆ بڵێ. ئەم بۆچوونە لەپیاوێکی میلونێردا زۆر نی یە؟.

## ١١٥٢- فرانسواز ساگان

حەز دەکەم پیاوان، پیاوانە هەلسوکەوت بکەن. یانی توندو منداڵانە.

**١١٥٣- جۆن ڕۆبەرت فاولز**

پیاوان حەزیان لەشەڕە. چونکە شەڕ بەوان ڕواڵەتێکی جدی دەبەخشێ وئەمەش تەنها شتێکە کەناهێلێ ژنان پێیان پێبکەنن.

**١١٥٤- شازادە فیلیپ**

کاتێك پیاوێك دەرگای ئوتومبیلەکەی بۆهاوسەرەکەی دەکاتەوە، یان ئوتومبیلەکەی نوێ یە یان ژنەکەی.

**١١٥٥- جۆزیف.E. کۆسمان**

باشترین ڕێگا بۆ لەبیرنەکردنی ڕۆژی لەدایکبوونی خێزانەکەت ئەوەیە کە یەکجاری لەبیری بکەیت

**١١٥٦- مۆرتیمۆ کۆلینز**

هەر پیاوێك هەرئەوەندە پیرە کە هەستی پێ دەکات و هەر ژنێك هەمان ئەندازە کە ڕوخساری دەردەخات.

**١١٥٧- G.W کۆمەر**

زۆربەی پیاوان دوو ئارەزووی گەورەیان هەیە. یەکەم هەبوونی خانوویەك، دووهەم هەبوونی ئوتومبیلێك بۆ هەڵهاتن لەماڵەوە.

**١١٥٨ — جیمس کایاکۆس**

من ئیتر گەیشتوم بەنائومیدترین وێستگەی ژیانم، ئێستا ژنەکەم متمانەم پێ دەکات.

**١١٥٩- ئینسان لەڕووی پەیوەندیەوە دەناسرێتەوە کە پێی وایە هیچ کەسێك ئاگای لەوانە نی یە.**

## ١١٦٠- ئاگاتاكريستى

شوێنەوار ناس باشترین مێردن كە ژنان دەتوانن هەیانبێ. چونكە هەرچی تەمەنیان دەچێتە سەرەوە. خۆشەویستی مێردەكانیان بۆ ئەوان زیاتر دەبێت.

## ١١٦١- كریستینا. مەلیكەی سوید

پیاوانم خۆشدەوێت بەڵام نەك لەبەر پیاو بونیان بەڵكو لەبەر ئەوەی ژن نین.

## ١١٦٢- جیلی كوپەر

مرۆڤ نێرینەی ئاژەڵێكی ماڵی یە ئەگەر لێبڕاوانە و بەخۆشەویستی یەوە ڕەفتاری لەگەڵ بكەی زۆر شت فێر دەبێت.

## ١١٦٣- جۆكۆك

لەنێوان هەموو خزم و كەسوكاری ژنەكەم خۆمم لە هەمووی خۆشتر دەوێ.

## ١١٦٤- دانی كی

پیاوی ژیر كەسێكە كە دوای سەركەوتنی لەمشت ومڕدا. داوای لێبوردن لەژنەكەی دەكات.

## ١١٦٥- ئالان كینگ

گەورەترین ڕاز بۆ پیاوی خێزاندار ئەوەیە كە پیاوی سەڵت چی بەپارەكانی دەكات.

## ١١٦٦- دوریس لیسینگ

ئێوەی پیاوان شتێكتان ناوێ مەگەر هەموو شتێك. ئەویش دیارە تاكاتێك كە پێویستت پێ یەتی.

## ١١٦٧- ئۆسكار وایلد

پیاوانی لاو دەیانەوێ وەفادار بن ونین، پیرەمێردەکان دەیانەوێ بێ وەفایی بکەن بەڵام ناتوانن.

## ١١٦٨- ئانا هێربەرت

پیاوی سەڵت کەسێکە کە پێش چوونە سەرکار قاوەڵتی یەك ئامادە دەکات.

## ١١٦٩- A.M.A نیوز

باشترین کار ئەوەیە کە کێشەی خۆت بۆ خەڵك باس مەکە. نیوەی ئەوان حەز بەبیستنی ناکەن ونیوەکەی تریان بەبیستنی خۆشحاڵ دەبن.

## ١١٧٠- ئەن لاندرز

تەلەفزیۆن سەلماندویەتی کە خەڵکی ئامادەن سەیری هەرشتێك بکەن تەنها سەیری یەکتر نە.

## ١١٧١- بۆب نیوهارت

ئەیب.ئەگەر پێنووس وکاغەزت لایە تکایە ئەم ووتەیە بنووسە: "ژمارەیەك لەخەڵکی بۆ هەمیشە دەتوانرێ فریو بدرێت بەڵام هەمو خەڵکی بۆ هەمیشە ناتوانی فریوو بدەیت: بەڵام تۆ ئەیب. بەجۆرێکی تر ڕەفتار بکە. چونکە دواین ووتەیەك کە بەدەستم گەیشتووە بەم شێوەیە بووە: " هەموو خەڵکی بۆ هەمیشە دەتوانی فریوو بدەی.... ".

## ١١٧٢- جین ئۆستین

دکتور هاڵم ئەوەندە بەئەزیەتباری بینی کە وەکو ئەوەی دایکی مردبێ یان هاوسەرەکەی یان خۆی.

## ١١٧٣- وودی ئالن

من نامەوێ بەهۆی بەرهەمەکانمەوە نەمر بم. حەزدەکەم پێش مردن بەم خواستەم بگەم.

## ١١٧٤- وودی ئالن

مەسەلە ئەوەنیە کەلەمردن بترسم. شتێك کە هەیە نامەوێ لەکاتی ڕوودانی لەوێ بم.

## ١١٧٥- هیلار بلۆك

بریا دوای مردنم خەڵکی بڵێن: کارنامەکەی ڕەش بوو بەڵام کتێبەکانی پڕ خوێنەر.

## ١١٧٦- فرانسیس بۆمۆنت

فلاستەر: ئا.تۆنازانی مردن چی یە؟

بیلاریۆ: دەزانم.سەروەرم. دەزانم. مردن شتێکە کەمتر لەهاتنە دونیا.خەوێکە نەبەدی. ئاسودەیی وئەو شتەی کەئێمە هەموو لەدوایەوەین وبەدەر لەهەموو ئیرەیی و ئەوشتەی کە ئێمە هەموو بەدوایەوەین ولەدوای هەموو ئەمانە. دەزانم کە مردن دۆڕاندنی یاریەکە کەدەبێ بیدۆڕێنێ.

## ١١٧٧- برێندان بیهان

کاتێك کە گەرامەوە بۆ دبلن بیستم کەبەئامادەنەبوونی خۆم دادگایی کراوم وبڕیاری مەرگم بەسەردا دراوە. منیش ووتم " زۆرباشە. کەواتە. لوتف بفەرموون بەنەبوونی خۆیشم لەسێدارەم بدەن."

## ١١٧٨- مارك توین

لەڕاپۆرتە هەواڵی مەرگی من زۆر بڵێیان کردووە.

## ١١٩٧- مارك توين

(دەربارەی مردنی یەکێك لەسیاسەتمەداران )

من لەمەراسیمی ناشتنی تەرمی ئەودا بەشدار نەبووم، بەڵام بەنامەیەکی بەئەدەبانە هاوخەمی خۆم ڕاگەیاند.

## ١١٨٠- دیڤید لۆید جۆرج

مەرگ گونجاوترین کاتە بۆ وەرگرتنی باج لەدەوڵەمەندەکان.

## ١١٨١- ساکی

والدۆ لەوپیاوانەیە کەئەگەر بمرێت لەوەی کە ئێستا هەیە زۆر باشترە.

## ١١٨٢- نیل سیمۆن

ئێستا ئیتر بیرکردنەوە لەمردن بووەتە بەشێك لەژیانم. هەر ڕۆژێ لافیتەی پرسەکان دەخوێنمەوە تابەبینینی ناوی خۆم لەلیستی مردوەکاندا هەست بەشادی بکەم.

## ١١٨٣- بنجامین فرانکلین

لەم دونیایەدا هیچ شتێك حەتمی نی یە. مەگەر مردن وسەرانە.

## ١١٨٤- سامۆیل تایلۆر کۆلریج

مراویەکان پێش ئەوەی بمرن ئاواز دەخوێنن. بریا هەندێکیان پێش ئەوەی ئاواز بخوێنن بمرن.

## ١١٨٥- نویل کۆوارد

شتێك سەبارەت بەمردنم بەڕاستی خەفەتبارم دەکات و ئەوەش ئەوەیە کە پاش مردنم لێرەنیم تا ئەو قسە قۆڕانەی کە دەربارەی من دەینوسن بخوێنمەوە.. چی قسەی خۆش دەخرێتە پاڵم. چی ووتەی بێ بەڵگەی

کاریگەر کەلە ووتەی من دەگێڕنەوە کەمن لەتەمەنمدا نەمووتوە. بەڕاستی زۆر مەخابن کە لەچێژی بیستنی ئەم شتانە بێ بەش دەبم.

**١١٨٦- نویل کۆوارد**

ڕۆژنامەی تایمز دەخوێنمەوە. کاتێك دەبینم ناوم لەستوونی کۆچ کردووەکان نیە، ڕۆژەکانی تر شادمانم.

**١١٨٧- جۆن مینارد کینز**

لەماوەیەکی دوور درێژدا هەموومان مردوین.

**١١٨٨- هاری گراهام**

بەبەرێز جۆنسیان ووت :" خزمەتکارەکەت لەکارەساتێکدا دوولەت بووە."

بەرێز جۆنس ووتی :" بەجدی ! مردووە؟".

کەواتا تکایە ئەو نیوەی کە کلیلەکانی منی پێوەیە بۆم بنێرن".

**١١٨٩- مولێر**

ئینسان تەنها یەك جار دەمرێت. ئەویش بۆماوەیەکی وا دوور ودرێژ !.

**١١٩٠- ماگات میشێل**

بۆ سێ شت هەرگیز کاتی دیاریکراو بوونی نیە. مردن وباج و لەدایکبوون.

**١١٩١- فردریك نیچە**

کاتی من هێشتا نەهاتووتە پێشێ. کەسانێك هەن کەلەدوای مردن لەدایك دەبنەوە.

**١١١٩٢- ئۆسکار وایلد**

( دوای بیستنی تاریفی زۆری نەشتەرگەری)

ئای. زۆرباشە، وادیارە دەبێت بەدەر لەتوانای خۆم بمرم.

## ١١٩٣-ئۆسكار وایلد

ئەمڕۆ ئینسان لەدەستی هەرشتێك دەتوانێت گیانی سەلامەت بێ جگە لە مردن و هەرشتێك دەتوانین فەرامۆش بکەین جگە لەناوی چاك.

## ١١٩٤- لۆرد هۆلاند

( لەسەر جێگەی دوانەخۆشی)

ئەگەر بەرێز سیلوین دوبارە هاتن ڕێنمایی بکە بێتە سەرەوە: ئەگەر زیندوو بووم. من بەدیتنی ئەو خۆشحاڵ دەبم وئەگەر مردبووم ئەو بەدیتنی من.

## ١١٩٥- هۆراس

من بەتەواوی نامرم.

## ١١٩٦- تۆماس ڕاس ئیبارا

مەسیحی کەسێکە کە:

لەکردەوەکانی شەممە، تۆبە دەکات یەکشەممە، تادوبارەیان بکاتەوە دووشەممە.

## ١١٩٧- تۆماس شش

مامۆستا دەبێ زۆرترین توانا و کەمترین دەسەڵاتی هەبێت.

## ١١٩٨- جۆرج..B لیۆنارد

مامۆستاکان زۆر کاردەکەن وکەم موچەوەردەگرن.لەڕاستی لانەیەین.

ڕاگرتنی لافاوی توانای مرۆڤەکان کارێکی سەغڵەت وتاقەت برە.

## ١١٩٩- فرانك لۆیدڕایت

پزیشکەکان دەتوانن هەڵەکانی خۆیان ژێرخاك بکەن بەڵام تەلارسازان تەنها دەتوانن وەسیەت بۆ کڕیارەکانی خۆیان بکەن کە پیچك بڕوێنن.

## ١٢٠٠- شتيڤن فرى

هونەرى تەلارسازى دەرفەتى بىٚ وێنە دەخاتە بەردەم هەر تەلارسازێك تا يارمەتى كۆمەڵگەى خۆى بدات. جوانى تاڤگەكان زۆر تر بكا. بەوژينگەى تيا دەژى جوانى و پاكى و بەكورتى. هەموو مرۆڤەكان خزمەت بكات.ئێستا بهێنە پێش چاو كە تەلار سازى سەركەوتوو دەبێت بەچى مەترسيەكدا تێپەڕبىٚ هەتا پارەيەكى دروست وباش بەدەست بهێنێت.

## ١٢٠١- ئالان بنت

فرانكلين : كاكى بەرێوەبەر. هيچ بيرت كردوەتەوە كە ميلاكەكانى(ئستاندارد) ى تۆ ڕەنگە كەمێك كۆنە بێت؟.

بەرێوەبەرى قوتابخانە : وايە. ئەوانە هەميشە كۆنەن.ئەگەر وانەبوايە نموونەيى نەدەبوون.

## ١٢٠٢- ئەلبێرت ئەنشتاين

ئەگەر تيۆرى ڕێژەيى من بێتە سەلماندن. ئەڵمانيا.ئەڵمانى بوونم ڕادەگەيەنىٚ وفەرەنسا ڕايدەگەيەنىٚ من هاوڵاتيەكى جيهانيم. بەڵام ئەگەر تيۆرەكە ڕاست نەبىٚ فەرەنسا من بەئەڵمانى وئەڵمانيا من بەجولەكە دەزانێت.

## ١٢٠٣- وابەستە بە : ئەندرىٚ جيد

بۆ فەرەنسى يەكان جێگەى باوەڕنەكردنە كە بەتەمەنى نێوەنجى بگەن وپەيوەندى ونيشانەى ليجوين دونوەر نەگرن.

## ١٢٠٤- جۆرج موور

ئێرلەند. نەخۆشيەكى كوشندەيە.كوشندە بۆ ئينگليزەكان ودوو ئەوەندە بۆ ئێرلەنديەكان.

## ١٢٠٥- ماريان مۆر

گرفتارم. نارازیم. ئێرلەندیم.

## ١٢٠٦- نەناسراو

یەکەمی : بۆچی جولەکەکان پرسیار بەپرسیار وەڵامدەدەنەوە ؟

دووەمی : بۆ نابێت جولەکەکان پرسیار بە پرسیار وەڵام بدەنەوە ؟

## ١٢٠٧- دۆگ ولینگتۆن

( لەحاشاکردنی لەڕەسەنێتی ونەژادی ئێرلەندی خۆی)

هەر کەسێك لەتەویلە هاتبێتە دونیاوە بەزۆر کەر نی یە.

## ١٢٠٨- ئەلکساندەر دوما

هەربڕیارێکی گشتگیر مەترسیدارە تەنانەت ئەم بڕیارەش

## ١٢٠٩- جۆرج برناردشۆ

ئینسانی مەنتقی خۆی لەگەڵ دنیادا دەسازێنێ. بەڵام ئینسانی نامەنتقی دەیەوێ دنیا لەگەڵ خۆی بسازێنێ. لەبەرئەوە هەموو پێشکەوتنەکانی جیهان قەرزاری کەسانی نامەنتقین.

## ١٢١٠- ئالدۆس هۆکسلی

لێبووردن لەیەکجار زۆرتر بوو، ئەوەندە جێ ی ڕازی بوون نی یە.

## ١٢١١- سیر ئیدوارد ئاپلیتۆن

کاتێك لەزمانی ئۆپێرا شتێ سەردەرناهێنم ئیتر بەلامەوە گرنگ نیە بەچی زمانێك دەوترێتەوە.

## ١٢١٢- لويس ئارامسترۆنگ

هەمو مۆسيقاكان مۆسيقای خەڵكن. من تائێستا نەمبيستوە ئەسپەكان ئاواز بخوێنن.

## ١٢١٣- ئارتور شنابل ( پيانۆژەن )

من دوو جۆر گوێگر زياتر ناناسم: ئەوانەی كە دەكۆكن وئەوانەی كەناكۆكن

## ١٢١٤- ئارتۆر هونگەر

دوودڵی تيانيە كەيەكەمين مەرجی ئاوازدانەر مردنە.

## ١٢١٥- جۆرج ئايد

مامۆستای مۆسيقا هەفتەی دووجار دەهات تا ئەو كەلێنەمەترسيدارەی نێوان شوين ودوروتی پڕ بكاتەوە.

## ١٢١٦- چارلز بودلەر

من زۆر حەزم لەمۆسيقای واگنەرە.بەلام مۆسيقايەك بەزياتری دەزانم مۆسيقای پەنجەكانی پشيلەيەكە كە لەپشتی پەنجەرەكەوە بەكلك هەڵواسراوەوبەپەنجەكانی خۆی لەشوشەكە دەدات.

## ١٢١٧- تۆماس بيچام

لەكاری هەر ئۆركسترايەكدا دو بنەمای گومان هەڵنەگر هەيە: پێكەوە دەست پێ بكەن و پێكەوە كۆتايی بێت. خەڵكی چوزانن لەنێوان ئەم دووە چی دەگوزەرێ.

## ١٢١٨- ئەرتۆرۆتوسكانينی

( قەسەكردن بۆ ئەندامانی ئۆركسترای خۆی لەكاتی پرۆڤەيەكی سەخت)

کاتێك مردم دوبارە دەگەڕێمەوە سەرزەوی ولەڕقی ئێوە دەبمە دەرگەوانی ڕوسپی ماڵەوە، ئەوکاتە ناهێڵم هیچ کامتان بێنە ماڵەوە.

**١٢١٩- جیمی دۆرانت**

لەمۆسیقا بێزارم. بەتایبەت لەکاتی ژەنینی.

**١٢٢٠- هووارد دیتز**

من ئاواز دانەرێك کە بیر دەکاتەوە خۆشم ناوێت. ئەم کارە ڕێگری لەدزینی هونەرەکەی دەکات.

**١٢٢١- ستیڤ ڕاس**

کاتێك ئینسان تەمەنی دەبێتە سی وپێنج ساڵ. هەمیشە ڕووداوێکی خراپ بۆ مۆسیقا دێتە پێشەوە.

**١٢٢٢- جۆرج سانتیانا**

مۆسیقا لەبنەڕەتەوە بێ سوودە. وەکو ژیان.

**١٢٢٣- ئەندرس سگۆڤیا**

ئەوهونەرمەندانەی کە دەڵێن ڕۆژانە هەشت کاتژمێر پرۆڤە دەکەن یان کەرن یان درۆزن.

**١٢٢٤- ١٢٢٤- ئیدیت ستیویل**

بریا دەوڵەت لەسەر پیانۆی ژەنیارە نەزانەکان سەرانەی دادەنا.

**١٢٢٥- جۆرج برناردشۆ**

دۆزەخ پڕ لە مۆسیقاری بەدڵخوازە. مۆسیقا شەرابی دۆزەخیەکانە.

## ١١٢٦- نيڤڵ كاردۆس

ئێستا خراپترین میوزیك ژەنەكەكانی پیانۆ سێ كەسن. یەكێكیان خۆمم و ئەوی تر جیمس ئەگێت. لەناوهێنانی سێ یەمی داوای لێ بووردن دەكەم.چونكە ئەو میوزیك ژەنێكی ناودارە.

## ١٢٢٧- جولیس گنكۆرت

لەبارەی مۆسیقا.شتێك كەزیاتر لەهەموو شتێك خۆشم دەوێ. ئەو ژنانەن كە گوێ لەمۆسیقا دەگرن.

## ١٢٢٨- ئارتۆ سنابڵ

لیونارد برنشتاین چەند ڕازێكی لەمۆسیقا ئاشكرا كرد كە چوار سەد ساڵە ئاشكرا بووە.

## ١٢٢٩- فردریك لۆو

من حەزم لەمۆسیقای خۆم نی یە. بەڵام ڕای من لەبەرامبەر ڕای ملیونەها كەس ئیتر چی سودێكی هەیە.

## ١٢٣٠- نیچە

ژیان بەبێ مۆسیقا هەڵەیەك زیاتر هیچ نیە.

## ١٢٣١- ئۆسكار وایڵد

مۆسیقای واگنەرم لەمۆسیقای هەر كەسێكی تر زیاتر خۆشدەوێت.چونكە ئەوەندە دەنگی بەرزە لەسەرەتاوە تا كۆتایی دەتوانێت قسەبكەیت بەبێ ئەوەی خەڵكی ببیستن چی دەڵێی.

## ١٢٣٢- ئۆسكاروایلد

چەندە لۆژیکی خەڵکانی مۆسیقی مایەی پێکەنینە. بەڕاستی لەساتێکدا کە حەز دەکەیت کەڕ بیت. ئەوان چاوەڕوانن بەتەواوی لاڵ ببیت.

## ١٢٣٣- جۆرج هێربێرت

مۆسیقا لەدوای ددان ئێشە بەکەڵك نایەت.

## ١٢٣٤- فرانك مەك کینی هوبارد

مۆسیقای کلاسیك، مۆسیقایەکە، کە هەر ساتێ پێت وایە دەگۆڕێت بەگۆرانی.

## ١٢٣٥- وودی ئالن

وەڵامی سەرەکی خۆشەویستی یە بەڵام لەوکاتەی کەچاوەڕوانی وەڵامیت. سێکس مەسەلەی بەچێژ دێنێتە ئاراوە.

## ١٢٣٦- جۆنۆرتۆن

مایك : بۆ ئەوکارانەی کەلەتۆ وەشاوەتەوە لەزمانی ئێرلەندی دەستەواژەیەك نادۆزیتەوە.

ویڵسون : لەزمانی ( لاپلەندی)ش دەستەواژەیەکمان بۆ بەفر نی یە.

## ١٢٣٧- یوبی بلاك

( کاتێك لەبلاك لەتەمەنی نەوەدوحەوت ساڵی لێیان پرسی ئارەزووی سێکسی لەچی تەمەنێکدا دادەمرکێتەوە. لەوەڵامدا ووتی :" دەبێ لەکەسێك کە لەمن بەتەمەنترە بپرسیت.

## ١٢٣٨- شارڵ بوولەر

ئەوەی سەبارەت بە خۆشەویستی مرۆڤ ئازار دەدا ئەوەیە کە خۆشەویستی تاوانێکە پێویستی بە شەریکی یە.

## ١٢٣٩- رۆجەر پروبەرت

مەبەست لەفێربوونی هەموو بابەتەکان دروستکردنی پەیوەندی یە. جی ی سەرسوڕمان دەبێ ئەگەر لەبارەی بابەتەسێکسیەکانەوە وەها نەبێت.

## ١٢٤٠- وابەستەبە : گلیندا جاکسون

مەسەلەی گرنگ لەکاری نواندندا ئەوەیە کەئینسان بتوانێ بگری و پێبکەنێ.من هەر کاتێك دەمەوێ بگریم. بیر لەژیانی سێکسی خۆم دەکەمەوە وهەرکاتێك دەمەوێ پێ بکەنم دوبارە بیر لەژیانی سێکسی خۆم دەکەمەوە.

## ١٢٤١- ولیام شکسپیر

جێگەی سەرسورمان نیە کەئارەزووکردن بە کارێك. ساڵەهای ساڵ دوای ئەنجامدانی ئەوکارە دەمێنێتەوە؟

## ١٢٤٢- سۆفۆکلیس

بەس خۆشحاڵم کەلەدەستی هەوەس ڕزگار بووم. وەك لەدەستی خاوەن ماڵی شێت و بێ مروەت.

## ١٢٤٣- کریستۆڤەر مارلۆ

بارناردیان: تاوانی تۆ تێکەوتنە..

باراباس : زینایە؟. چونکە لەم ویلایەتە نەبووە. ئەو ژنەش کەمردووە.

**١٢٤٤- جۆرج برناردشۆ**

هەر پیاوێکی سەرووی چل ساڵ بەدکارە.

**١٢٤٥- نەناسراو**

بەساڵاچوون کاتێکە هەروەك لەسەردوورێیانی بیروڕای خراپدابیت.

**١٢٤٦- نێردراو: N.R هارگرۆڤ**

لەدڵدا خۆشیەکانی دوای چل ساڵی یەکێکیان ئەوەیە کە چیتر جوانەمەرگ نابی.

**١٢٤٧- ئەلسا ماکسویل**

دوای داهێنانی ڕۆنی گەرچەك. بەبێ شك خراپترین داهێنان میوانداری پاش نیوەڕوانە بەبیبسی ئەلکهولی.

**١٢٤٨- چارلز مریل سمیس**

میوانداری پاش نیوەڕۆ. هۆکارێکە بۆ لەکۆڵ کردنەوەی ئەوکەسانەی کە حەزناکەین بۆنانی ئێوارە بانگهێشتیان بکەین.

**١٢٤٩- ئەلبێرت ئەنشتاین**

نەتەوە پەرستی نەخۆشی سەردەمی منداڵی و سورێژەی نەژادی مرڤە.

**١٢٥٠- بەرتراند ڕاسل**

نیشتمان پەرستی واتا ئامادەبوون بۆ کوشتن وکوژران لەبەر شتی نابەجێ.

**١٢٥١- ئۆسکار وایلد**

نیشتمان پەرستی بەخششی بەدکارانە.

### ١٢٥٢- بلاس پاسكاڵ

ئەم نامەیە لەئاستی پێویست تێپەڕی. هۆكارەكەی ئەوەیە كەكاتی كورت

كردنەوەیم نەبوو.

### ١٢٥٣- لی پوویل

لەمانەوەی یەك شەوی تۆ سوپاسگوزارم.

### ١٢٥٤- ماكس ڕیجەر

( لەوەڵامدانەوەی ڕەخنەیەكی توندی" ڕۆدۆڵف لویس " كەنووسیبووی)

هەر ئێستا كە لەبچوكترین ژووری ماڵەكەم دانیشتووم. وتارەكەی تۆ

لەبەردەمی مندایە. تاچەند ساتێكی تر لە لایەنی بەرامبەر دەبێت.

### ١٢٥٥- تۆماس ئەدیسۆن

بلیمەتی ٩٩٪ كاروكۆششە و١٠٪ هەست وسۆزە.

### ١٢٥٦- ڕۆبەرت .G. ئینگرساڵ

بوونی بلیمەت لەكۆماری بێ بایەخەكان مەترسیدارە.

### ١٢٥٧- ئۆسكار وایڵد

حەوسەڵەی هەموو خەڵكی سەرسام ئاوەرە.هەموو شتێكت پێ دەبەخشن

جگە لە بیلمەتی.

### ١٢٥٨- ئۆسكار وایڵد

( لەگومرگی نیۆیۆرك)

بۆ دەربڕین شتێكم نی یە. جگە لە لێهاتوویی.

**١٢٥٩- ئیگناس جان پاردرویسکی ( دەربارەی مۆسیقای جاز )**

چی تۆڵەکردنەوەیەکی ترسناکە، کلتوری ڕەش پێستەکان لەکلتوری سپی پێستەکانی وەرگرت.

**١٢٦٠- وابەستە بە : مارتین لۆتەر کینگ**

من دەمەوێ برای سپی پێستەکان بم نەك ژن برایان.

**١٢٦١- وابەستە بە : سیریل کانوڵی**

( جەنگی نێوان نەوەکان) تەنها جەنگێکە کە تیایدا هەمووشتێ دەگۆڕێت.

**١٢٦٢- لویس هۆمفۆرد**

هەرنەوەیەك لەگەڵ باوکی دژە ولەگەڵ باپیرەیدا دۆستە.

**١٢٦٣- ئەندریا ڤورژنسکی**

تفی کرد، ڕۆژگار لەمن. من لە ڕۆژگار.

**١٢٦٤- هێربەرت بیربۆم تری**

کاکی بەرێز :

شانۆنامەکەی بەرێزتانم خوێندنەوە. ئای. بەرێز !. ویستی بەرێزتانە.

**١٢٦٥- وابەستە بە : چالینگ پۆلۆك**

ڕەخنەگر کەسێکی گێڕە کە ڕاهێنانی ڕاکردن دەدات.

**١٢٦٦- بنجامین دیزریلی**

دەزانیت ڕەخنەگران چی کەسانێکن؟ کەسانێك کەلەئەدەبیات وهونەردا شکستیان خواردووە.

## ١٢٦٧- ئيريك ساتى

بابەتى ووتارەكەم لەساڵى رابووردو( هۆش ودەركى مۆسيقا لەئاژەڵان)بوو.
ئەمرۆدەمەوێ دەربارەى(هۆش ودەركى مۆسيقا لەلاى ڕەخنەگران )
قسەبكەم. ئەم بابەتە زۆر هاوشێوەى بابەتەكەى ساڵى پێشووە.

## ١٢٦٨- جان سيبليوس

بەقسەى ڕەخنەگران هەرگيز گوێ نەدەى. تائێستا هيچ پەيكەرێك
بەشانازى ڕەخنەگرێك دانەنراوە.

## ١٢٦٩- دودلى فيلدمالون

لەژياندا هەرگيز لەگەڵ ئەوەى لەگەڵما هاوڕابووە. شتێكم فێرى نەكردووە.

## ١٢٧٠- جۆرج موور

ڕەخنەگرانى بەكۆمەڵ لەڕووى ئەوشتانەى كە نەيانتوانيوە تێبگەن بناسين.

## ١٢٧١-ئۆسكار وايلد

وايلد: من هەميشە ئێوە بەچاوى باشترين ڕەخنەگر سەير دەكەم.
ترى : من كە هەرگيز شانۆنامەكانى تۆم ڕخنە لێ نەگرتووە.
وايلد : بۆ ئەوەدەڵێم.

## ١٢٧٢- وابەستەبە : ئۆسكار وايلد

مرۆڤ دەبێ دڵێكى هەبێ لەبەردى خارا كە مەرگى نيلى چكۆلە بخوێنێتەوە
وپێكەنينى نەيەت.

## ١٢٧٣- E.A هاوسمان

داهێنانە نوێ يەكانى بەرێز ئۆين تا ئەو جێگەى كە من دەيبينم بەلەبەر
چاوگرتنى چۆنێتيان بەهايەكى گەورە و دياريان تيايە. ئەوەش دەگمەن
بوونيانە.

## ١٢٧٤- كارۆڵ برنت

کۆمیدی هەمان تراژیدیایە.سەربارەی کات.

## ١٢٧٥- پیتەر یۆستینۆف

کۆمیدی شێوازێکی گاڵتەجاڕی یە بۆ جدی بوون.

## ١٢٧٦- کینگز لی ئەمیس

ئەگەر مرۆڤ نەتوانێ بەنوسین کەسێك نیگەران بکات. بەڕای من بەبێ خود

دەنووسێت.

## ١٢٧٧- جۆرج ئاید

دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لەبڵاوکەرەوان نووسینەکەیان پەسەند نەکرد

بڕیاریدا بۆنەوەی ئایندەی بنوسێ.

## ١٢٧٨- ڕۆبەرت پنچلی

دوازدەساڵ کاتی خۆم کوشت تا زانیم کە بۆ نووسین توانایەکم نی یە. بەڵام

چیتر نەمتوانی دەست لەم کارە هەڵبگرم.چونکە لەڕادەبەدەر ناودار ببووم.

## ١٢٧٩- جاك بینی

( لەڕێو ڕیۆڕسمی وەرگرتنی خەڵات)

من شایانی ئەم خەلاتە نیم. بەڵام شایانی."ئارتریتس" یش نیم کە

وەرمگرتووە.

## ١٢٨٠- ئەلکساندەر پۆپ

ناوبژیکاری خەڵکی لەحەقی نووسەران سەیر و سەمەرەیە: گەورەکانیان

بەشێت ناودەبەن و داناکانیان بەگەوج.

## ١٢٨١- چريل تيگس

خەوشی نووسەری لەوەدایە کە ئەوەندە پارەی تیا نیە.

## ١٢٨٢- سامۆیل جۆنسۆن

هەرچی بەبیٚ زەحمەت بنوسریٚت بەبیٚ چیٚژ دەخویٚنریٚتەوە.

## ١٢٨٣- سامۆیل جۆنسۆن

تەنها گەوجەکانن کە هەر بۆ پارە دەنووسن.

## ١٢٨٤- سکۆت فیتزجیرالّد

پالّەوانیٚکم نیشان بدە تا تراژیدیایەکت بۆ بنووسم.

## ١٢٨٥- جیمس جۆیس

( کاتیٚك کە یەکیٚك لەلاوە ستایشکارەکانی جیمس جۆیس تکای لیٚکرد کە ئەودەستەی کە "ئۆلیس":ی پیٚ نووسیوە ماچ بکات. جۆیس ووتی.)

نە.ئەم دەستەم زۆرکاری تری کردووە.

## ١٢٨٦- ریمۆند چاندلەر

ئەگەر کتیٚبەکانم لەمەخراپتر ببوایەن بانگهیٚشتی هۆلیوود نەدەکرام و ئەگەر باشتر ببوایەن خۆم نەدەهاتم بۆ هۆلیوود.

## ١٢٨٧- ئەنتۆن چیخۆف

پزیشکی هاوسەری یاسایی، وئەدەبیات خۆشەویستی منە. کاتیٚك لەیەکیٚکیان ماندوو دەبم. شەوگار لەگەلّ ئەوی تریان بەسەر دەبەم.

## ١٢٨٨- وینستۆن چەرچلّ

نوسینی هەرکتیٚبیٚك رووداویٚکە کەبەسەیران و گەڕان لەمرۆڤەوە نزیك دەبیٚتەوە. پاشان مەعشوقی ئینسان دەبیٚ. ئەوکاتە ئەرباب ولەکۆتایدا وەکو تاکرەویٚکی تەواو ئەندازە دەردیٚت.

## ١٢٨٩- بنجامين ديزريلى

كارى نووسەرێك كەباسى كتێبەكانى خۆى دەكات. كەم و زۆر بەوئەندازەيە ناخۆشە كە دايكێك باس لەمنداڵەكانى خۆى دەكات.

## ١٢٩٠- بورتۆن ڕاسكۆ

شتێك كە ژنى هيچ نووسەرێك ناتوانێت تێبگات ئەوەيە كە كاتێ هاوسەرەكەى لەپەنجەرەكەوە سەرنجى دەرەوە دەدا. سەرگەرمى كارە.

## ١٢٩١- جوليس ڕونارد

نووسەرى تەنها پيشەيەكە كە ئەگەر پارەى پێ دەرنەهێينى كەس گاڵتەت پێ ناكات.

## ١٢٩٢- وابەستە بە : جۆرج برناردشۆ

پارەى خەلاَتى نوبلێ تەناف ڕزگار بوونە كە بۆ مەلەوانێك فرێدەدرێت كە ئيتر خۆى گەيشتوەتە كەنارى ڕزگار بوون.

## ١٢٩٣- فرانسوا ڕينە چاتوبريان

نوسەرى نوێخواز ئەوەنيە كە لاسايى كردنەوەى كەسانى تر ڕەتدەكاتەوە. بەڵكو ئەوەيەكە هيچ كەسێ ناتوانێت لاسايى بكاتەوە.

## ١٢٩٤- كوينتين كريسپ

بوون بە نووسەر سێ هۆكارى هەيە: يەكەم ئەوەى پارەت پێويستە. دووەم ئەوەى كە شتێكت هەيە بۆ وتن كەبەلاى خۆتەوە دەبێ هەموو دنيا وهەموو كەسێك لێ ى ئاگادار بێت وسێ يەم ئەوەى كە نازانى بەشەوگارى درێژى زستان چى بكەيت.

## ١٢٩٥- ئان مەك وان

نابێ بە نووسەران متمانە بکەین بەڵام بەرهەمەکانیان دەبێ بخوێنرێتەوە.

## ١٢٩٦- مۆنتسکیۆ

نەخۆشی یەکەی من نووسینی کتێبە و شەرمەزار بوون دوای ئەوە.

## ١٢٩٧- وابەستە بە : سۆمەرست موام

بۆ نووسینی ڕۆمان سێ یاسا هەیە : بەدبەختانە هیچ کەسێك نازانێت ئەم سێ یاسایە چی یە.

## ١٢٩٨- جۆن مۆرتیمەر

کاتێك نووسەرێك کاری هەتا هەتایی نووسەری دەست پێ دەکات. شتێك کە بیرکردنەوەی ئازار دەدا دۆزینەوەی شێواز و دارشتنی تایبەت بەخۆیەتی.

## ١٢٩٩- فرینك مۆڵنار

( کاتێ لێیان پرسی چۆن بوە نووسەر)

دروست بەوشێوەیەی کە ژنێك دەکەوێتە ڕێگایەکی هەڵەوە: سەرەتا لەبەر خۆم کردم، چونکە خۆم حەزم دەکرد. پاشان بۆ ئەوەی هاوڕێکانم پێیان خۆشبوو لەدوایشدا لەپێناو پارە.

## ١٣٠٠- ویلسۆن میزنەر

دزی کردن لەنووسەرێك دزی ئەدەبی یە، بەڵام ئەگەر دزی لەچەند نووسەرێك بکەی دەبێت بە لێکۆڵینەوە.

**١٣٠١- ڤلادمير ناباكۆڤ**

**من وەکو بلیمەتەکان بیردەکەمەوە. وەکو نووسەرانی ناودار دەنووسم و وەکو منداڵان قسەدەکەم.**

**١٣٠٢- .S.V. ناپیول**

من لەژمارەی ئەو نوسەرانەم کە خەڵکی پێیان وایە. ئەوانی تر بەرهەمەکانیان دەخوێننەوە.

**١٣٠٣- وابەستەبە : ئیڤلین وا**

هەرگیز تێنەگەیشتم چۆن دوو کەس دەتوانن پێکەوە کتێب بنووسن. بەلای منەوە ئەم کارە وەکو ئەوەیە کە سێ کەس بیانەوێ پێکەوە منداڵیان ببێ

**١٣٠٤ - ئیڤلین وا**

**هەموو کەسێك دەتوانێت ڕۆمان بنوسێت. ئەوەندە بەسە کەشەش هەفتە کات و پێنووس وکاغەز بخەیتە بەردەستی وژنەکەی و تەلەفونەکەی لێ دوور بخەیتەوە.**

**١٣٠٥- ئیڤلین وا**

**بینینی " ستیڤن سپیندەر" و ئەوکارەی کەبەزمانی پاکی ئێمە دەیکات. ئەوەندە مەترسیدارە وەکو ئەوەی گوڵدانێکی دێرینی چینی بەدەستی مەیمونێکەوە ببینی.**

**١٣٠٦- ئۆسکار وایلد**

( نووسەر: وادەردەکەوێ ناوی من ڕووبەڕووی پیلانی بێدەنگی بووەتەوە.بەڕای تۆ لەبەرامبەر ئەم پیلانە چی بکەم)

ئۆسکار وایلد : پەیوەندی پێوە بکە.

## ١٣٠٧- ئۆسكار وايلد

ئەو ( برناردشۆ) نەلە هەموو جیهان دوژمنێکی هەیە و نەکەسێك لەدۆستەکانی خۆشیان دەوێت.

## ١٣٠٨- ئۆسكار وايلد

"هەنری جیمس" بەشێوەیەك چیرۆك دەنوسێت کە دەڵێ ی ئەرکێکی مەینەتبار ئەنجام دەدات.

## ١٣٠٩- ئۆسكار وايلد

وەبەلام جۆرج مریدیت. دارشتنی ئەو دارشتنێکی شێواوە کە جار جار بەهەورە بروسکەیەك دادەگیرسێ.ئەو لەپلەی نووسەر یدا پەی بەهەموو شت دەبات، جگە لە زمان, لەبواری ڕۆمان نووسیدا هەموو کارێکی لەدەست دێت، جگە لە چیرۆکنووسی و وەکو هونەرمەند هەموو تایبەتمەندیەکی تیایە، بێجگە لە توانای دەربڕین.

## ١٣١٠- وابەستە بە : ئۆسكار وايلد

هەموو سەر لەبەیانی یەك هەڵەچنی یەکێك لە شیعرەکانم دەکرد. دەرەنجام ئەوەبوو کە وێرگولێکم لێ هەڵگرت و پاش نیوەڕۆ هەمان وێرگوڵم لەجێ ی خۆی دانایەوە.

## ١٣١١- پیتەر دی ڤریس

من عاشقی نووسەریم. شتێك کە هەیە خۆشم نایە لەکاری نوسین.

## ١٣١٢- G.H ویلز

لەدونیا هیچ هەستێك ناتوانێ بەرامبەر بێ بەو هەست و سۆزەی مرۆڤ لەکاتی دەستکاری کردنی دەستنوسێکی کەسانی تر.

## ١٣١٣- ولیامی چوارەم

ڕووگرژترو،تەنانەت مەترسیدار تر لەنووسەر کەسێکی ترم نەدیوە.

## ١٣١٤- E.A هاوسمان

ئەمە هەرگیز ئەوشتەنیە کە ئەو نیازی ووتنی بوو، بەڵام دەتوانرێت چی بکرێت. پێنووس زۆری لەمەچەکی مرۆڤ زیاترە.

## ١٣١٥- هاینریش هاینە

هیچ نووسەرێك لەدیدی بڵاوکەرەوەکەیەوە بلیمەت نی یە.

## ١٣١٦- لیلیان هیلمەن

هەر نووسینێك بەباش بوونی ئومێدت بەستبێ، دوبارە بەوشێوەیەی کە چاوەڕوانیت دەرنایەت.

## ١٣١٧- دیزی ئاشفۆرد

برنارد بزانی ونەزانی ئیماندار ولەخوا ترس بوو. هەمیشە دەهاتە ناوهۆڵەکە. هەندێ دوعای دەکرد ودوای قسەکانی یەك پەرداخ ویسکی هەڵدەدا بەڵام" ساتلینا" خووی بەباسکردن و دوعاوە نەگرتبوو لەبەر ئەوە بەڕێی خۆیدا دەڕۆشت و دەنووووست.

## ١٣١٨- ڕۆبەرت فروست

پەروەردگار: لەگاڵتەکردنە بچوکەکانم لەحەقی خۆت خۆش ببە. منیش دیسان لەگاڵتەکردنە زۆر گەورەکانی تۆ لەحەقی خۆم خۆش دەبم.

## ١٣١٩- هاری.S ترومان

( دوای لابردنی جەنراڵ " مەك ئارسەر" فەرماندەی گشتی هێزەچەکدارەکانی ئەمریکا لە کۆریا.١٩٥١).

من ژەنەراڵ ئارسەرم بەوهۆیەوە لەسەر کار لابرد کە ڕێزی لەدەسەڵاتەکانی سەرۆك کۆمار نەدەگرت. هۆکارەکەی ئەوەیە. لەبەر ئەوە هۆکاری لەسەرکار لابردنی ئەوەنەبوو کە پیاوێکی حەرامزادەو بێ شعورە.( ئێستا لێگەرێن کە هەیە) چونکە بۆ ژەنراڵەکانی ئێمە. ئەم بابەتە لەڕووی یاساییەوە دوودڵی تیانیە ئەگەر هەیبوایە ئێستا نیوەی یان سێ بەشیان لەزیندانا دەبوون.

### ١٣٢٠ -جۆرجی دووەم

( لەوەڵامی " دۆك نیوکاسڵ" کە سکاڵای کردبوو وتبووی کە ژنەراڵ "وۆڵف" هار بووە. )

هارە؟. دەی خوا بکا گاز لەچەند کەسێکی تر لەجەنراڵەکانی من بگرێت.

### ١٣٢١- جۆرج برناردشۆ

من هەرگیز پێم وانی یە سەرباز بیر بکاتەوە.

### ١٣٢٢- جۆزێف هیلەر

من خۆم بەتەواوی پشکنی بوو تێگەیشتبووم کەبەکەڵکی خزمەتکردنی دەسەڵات نایەم.

### ١٣٢٣- جۆزێف هیلەر

کۆلۆنێل "کاتکارت" پیاوێکی ئازاو چاپووك بوو. ئەو لە پێشخستنی سەربازەکانی ساتێك دوودڵی نەدەکرد.

### ١٣٢٤- لۆرد پاڵمرستۆن

بمرم،دکتۆر گیان؟. نە. ئەمە دوایین کارە کە دەیکەم.

## ١٣٢٥- O.هەنری( ولیام سیدنی پۆرتەر)

گلۆپەکان داگیرسێنن. حەزناکەم بەتاریکی بڕۆمەماڵەوە.

## ١٣٢٦- بنجامین دیزریلی

( لەسەر جێگەی مردن بینینی مەلیکەی ڕەتکردەوە ووتی :"

نە. باشترە نەیەت، ئەو تەنها دەیەوێ پەیامەکانی بگەیەنم بەئەلبێرت.

## ١٣٢٧- وابەستە بە : ڤۆڵتێر

( کاتێك داوا لەو دەکەن لەسەرەمەرگدا لەشەیتان داوای پاکانە بکات)

ئێستا ئیتر کاتی دوژمنایەتیەکی تازە نی یە.

## ١٣٢٨- وودی ئالن

کاتێك منیان دزی دایك وباوکم بێ دواکەوتن دەست بەکاربوون

وژوورەکەمیان بەکرێ دا.

## ١٣٢٩- بیلی هۆلیدەی

کاتێ دایك و باوکم خێزانیان پێکەونا لەتەمەنی منداڵیدا بوون. باوکم

هەژدەساڵ بوو. دایکم شازدەساڵ ومنیش سێ ساڵ بووم.

## ١٣٣٠-ریچارد برینسلی شیریدان

ویژدان هەر ئەوەندە لەگەڵ سیاسەتمەداران سەروکاری هەیە وەکو لەگەڵ

جوامێراندا.

## ١٣٣١- L.H. مینکن

ویژدان بانگەوازێکە دەروونی کەئێمە ووریا دەکاتەوە کە کەسێك

چاودێرمانە.

## ١٣٣٢- ئۆسكار وایلد

ویژدان وترسنۆکی لەراستیدا یەك شتن. ویژدان ناوی بازرگانی ترسنۆکی یە

## ١٣٣٣- تۆم ستۆپارد

خەریکین سەبارەت بە ڕەوشتی خراپی یاریکەرانی تۆپی پێ تویژینەوەی فەلسەفی دەکەین.

## ١٣٣٤- تۆم ستوپارد

ڕەنگە ناپلیۆن بەهەڵەدا چووبێ کە دەیگوت ولآتی ئێمە. ولآتی دوکاندارەکانە.بەریتانیائەمڕۆبە وولآتی گۆڵچی یەکان دەچێت.

## ١٣٣٥- جۆن سناگ

( لەپێشبڕکێ ی کەشتی سواری نێوان ئۆکسفۆرد وکامبریج)

ناتوانم ببینم کێ لە پێشترە. یان ئۆکسفۆرد یان کامبریج.

## ١٣٣٦- .M.بیل

یاریکەری گۆڵف: ئەم سەردەمە زۆر سەیر بوو!. تا ئێستا ئەوەندە بەڕسوایی یاریم نەکردووە.

بەرامبەرەکەی: بەڕاستی ؟. کەواتە پێشتر یاریت کردووە ؟.

## ١٣٣٧- فێردی پاچکو

گاڵتەجاریە. شریتی ڤیدیۆی یاری نێوان محەمەد عەلی کلای و سپینکز بە(٨٩ و ٩٥) دۆلار دەفرۆشن. بەم پارەیە سپینکز خۆی دێت بۆمالآن.

## ١٣٣٨- بیل شانکلی

هەندێ کەس پێیان وایە تۆپی پێ مەسەلەی ژیان و مردنە.. دڵنیابە مەسەلەکە جدی ترە لەم قسانە.

**١٣٣٩- تۆم کانتر بوری**

عەیبی دەرمانەکان ئەوەیە کە گرنگ نیە بۆیان کام لایان دەیباتەوە.

**١٣٤٠- .G.W. گریس**

( لەئامۆژگاری هەمیشەیی خۆی بۆیاریکەرانی )

هیچ کاتێك بابەتێکی چاپی نەخوێننەوە. چاو بۆبینینی تۆپەکە لاواز دەکات.

**١٣٤١- .S.لی**

یاری زانێکی گۆلفی پەککەوتوو: کەسێك کە لەگەڵ بەرێوەبەرەکەی یاری دەکات.

**١٣٤٢- L.H.مینکن**

من بەهەمان ئەندازە لەوەرزش بێزارم کەهاندەرانی وەرزش لەمێشکی تەواو.

**١٣٤٣- فرانك مۆران**

( کاتیّ تیۆدۆر ڕۆزفلت لەپزیشکێکی ددانی پرسی کەبوو بەمشت زەن: بۆچی پیشەکەت گۆریوە ؟. لەوڵامدا وتی :"

چونکە شکانی ددان دەرامەدی لەدانانی زیاترە.

**١٣٤٤- ئەریك مۆرکامب وئەرنی وایز**

ئەرنی : پێشبرکیّ کە چۆن بوو؟.

ئەریك : دەزانی. یەك دوو خولەکی سەرەتا شانسی من بوو. پاشان کەپێشبرکیّ دەستی پیّ کرد وەکو شێر لەناوحەلەبەکە دەجووڵام چوومە

پێشەوە. سەرەتا لێدانێکی لای چەپ.دوبارە لێدانێکی تر لەلای چەپ وپاشان یەکڕاست بە لووتی.

ئەرنی : زۆرباشە !.

ئەریك : لەوکاتە بەرامبەرەکەم لە جێگەی خۆیەوە هاتە پێشەوە. بەڵام لەو یەك خولەکەی سەرەتا وەها حاڵیم گرت کە مەپرسە.

ئەرنی : چۆن چۆنی ؟.

ئەریك: هیچیٚ. پیٚ ی وابوو منی کووشتووە.

## ١٣٤٥- ڕینار بانهام

ڕیگای ئازاد جێگەیەکە کە لۆس ئەنجلوسیەکان ڕۆژی دووکاتژمێر لەئارامترین و شادی بەخش ترین کاتی ژیانی خۆیان لەویٚ دەبەنە سەر.

## ١٣٤٦-..D بنت

تەکسی : ئامرازێکە کەلەباراندا دەبیٚ بەئاوو دەچێتە ناو زەوی یەوە.

## ١٣٤٧- ڕۆبەرت پنچلی

شەوێك کاتێك پنچلی لەبارێك هاتە دەرەوە. دای بەسەر شانی جل ڕەسمی لەبەرێکدا کەلەبەر دەرگاکە وەستا بوو. ووتی :" تەکسی یەکم بۆ بگرە". کابرای جلی ڕەسمی پۆش بەتوورەییەوە گەڕایەوە وتی :" من دەرگەوان نیم. کاکە. دەریاوانم".

پنچلی بەهێمنی ووتی :" زۆر باشە. تورەمەبە. کەشتی یەکی جەنگیم بۆ بگرە".

**۱۳٤۸-..A دیکی**

چاککەر و ڕۆن گۆڕ بەخاوەن ئۆتومبێل: ئەگەر ڕای منت دەوێ. ڕۆنەکە هەڵبگرە. ئۆتۆمبیلەکە بگۆڕە.

**۱۳٤۹- نانسی میتفۆرد( لەسەفەر لەهلسنکی یەوە بۆمۆسکۆ)**

فڕۆکەیەکی نەفەر هەڵگری جوان بوو وەکو کوڵبەیەکی سپی وئاوێك لەگەڵ پەردەی مەخمەڵی. لە" پشتوێنی سەلامەتی ببەستە" وئەمجۆرە قسەقۆڕانە باسی نەبوو بەڕاستی پشتوێن هەر نەبوو.

**۱۳۵۰- .E.A هاوسمان**

دوای ڕووداوی ئاسمانی دوێنێ چیتر بڕیارمدا بە فڕۆکەی ئایر ئێکس پرێس سەفەر بکەم. چونکە بەلای کەمەوە تا چەند ڕۆژێك بەئاگا دەبن.

**۱۳۵۱- ئۆسکار وایلد**

من لەبەرامبەر هەمو شتێکدا دەتوانم بەرەنگاری بکەم جگە لە خەیاڵاتی خراپ.

**۱۳۵۲- مەی ویست**

من زۆرجار ناچمە ژێرباری خەیاڵی خراپ. مەگەر ئەوەی خەیاڵی خراپ زۆردار بێت.

**۱۳۵۳- جۆرج برناردشۆ**

پیاوی گەوج کاتێك کارێك دەکات کە لێ ی شەرمەزارە هەمیشە دەڵێ ڕاسپێردراو وشەرمەزارم.

**۱۳۵٤- ئۆسکار وایلد**

ئەرك شتێکە کەئەنجامدانی لەخەڵکانی تر چاوەڕوانین نەك لەخۆمان.

**١٣٥٥- S.T ئیلیوت**

بەڕای من هەندێ لەسەرنوسەران. نوسەرانی شکست خواردوون. وەك بڵێ ی زۆربەی نووسەران دیسان وەهان.

**١٣٥٦- ئەرنست بوون**

مرۆڤ کاتێك تێدەگا مریشکی دراوسێ کەی قازە. کەئیتر چوونە سەرەوە بەسەر دیواری دراوسێ کەی مەحاڵە.

**١٣٥٧- نێردراو: ئەنگێلا رۆبینسون**

شتی جوانکاری کاتێك بەشێوەی شتێکی پێویست دەریەت کە دراوسێ کەتان هەیبێ وتۆ نەتبێ

**١٣٥٨- ڕالف ریچاردسۆن**

هونەری نواندنی ئەکتەرکان تەنها لەوەدایە کە پێش لەکۆکەی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی دەگرێت.

**١٣٥٩- جۆزفین هوڵ**

شکسپیر کارەکانی زۆرماندووکەرە.تا پادشا نەبیت توانای دانیشتن نی یە.

**١٣٦٠- جۆن ئانۆی**

ژیان جوانە بەڵام مانای نی یە، کاری هونەر مانابەخشینە بەژیان.

**١٣٦١- جۆن هیت ستویز**

خراپ نی یە بزانین کە بۆ خەڵکی ناوهێنانی دەهونەرمەندی سەدە ئاسانترە لەدەسیاسەتمەداری سەدە.

**١٣٦٢- بقرات**

ژیان کورتە وهونەر دوورو درێژ.

### ١٣٦٣- جۆن سینگەر سارجینیت ( شێوەکار )

هەرکاتێك کە ڕوخسارێك دەکێشم. هاوڕێ یەك لەدەست دەدەم.

### ١٣٦٤- وابەستەبە : ئارسەر شوپنهاوەر

لەگەڵ بەرهەمێکی هونەری وەها ڕەفتار بکە کە لەگەڵ هاوشاریەکانی خۆتدا ڕەفتار دەکەیت. لێگەڕێ سەرەتا ئەو قسەکردن دەست پێ بکات.

### ١٣٦٥- جۆن ماری گیبۆن

من بەرەوام بەهونەرمەندێك کە پێش مردن سەرکەوتنێك بەدەست دێنێ بەدگومانم.

### ١٣٦٦- ئۆسکار وایلد

هیچ هونەرمەندێکی گەورە شتەکان بەوشێوەی کە واقعین نابینێت. ئەگەر وابیبینایە ئیتر هونەرمەند نەبوو.

### ١٣٦٧- ئۆسکار وایلد

ئەوەی دەمەوێ بیڵێم ئەوەیە کە بەڕاستی ژیان زۆر زیاتر لاسایی هونەر دەکاتەوە وەك هونەر لەژیان.

### ١٣٦٨- جیمس مەکنیل ویسلەر

( لەمەسەلەی تۆمارکردنی سکاڵا لەدژی ڕاسکین ولەوەلاّمدانەوەی ئەو پرسیارەی کە :" تۆ لەبری دوو ڕۆژ کارکردن داوای (٢١٠) پاوەن دەکەیت؟."

نەخێر. من ئەوبڕە پارەیە لەبری تەمەنێك زانست هۆنینەوە داوا دەکەم.

## ١٣٦٩- لۆگان پیرساڵ سمیس

سوپاس بۆخوا کە خۆر ئاوابوو من ئیتر ناچارنیم بڕۆمە دەرەوە تاڵە تەماشاکردنی ئەو چێژ وەرگرم.

## ١٣٧٠- لۆرد بایرون

زستانی بەریتانیا لەئۆگەستدا کۆتایی دێت تا جارێکی تر لەسێپتێمبەر دەست پێ بکاتەوە.

## ١٣٧١- نەناسراو

هەوا ئەوەندە سارد بوو کە گورگەکان مەڕەکانیان لەبەر خوریەکانیان دەخوارد.

## ١٣٧٢- پیتەر یۆستینۆف

ئێرە وڵاتێکی ئازادە، ئێمە مافی ئەومان هەیە لەشوێنە گشتیەکان دەست بخەینە ژیانی تۆوە.

## ★ ڤیکتۆر برۆگ

کاری باش بابانوئێل دەیکات کە ساڵی جارێك سەردانی خەڵك دەکات.

## ★ وابەستە بە : جۆرزێف گوبلز

ئەم پیاوە ( هتلەر) کەسێکی مەترسیدارە، بەهەرشتێك کە دەڵێت باوەڕی پێ یەتی.

## ★ نەناسراو

( لیدی کیل چێرمان) لەگەورە پڕوپاگەندە کارانی ئەم سەردەمەیە، ئەو هەر کەسێك بڵێت دەیناسێت تەنها خۆی نەبێ.

## ★ ئیڤلین وا

دیارە بروام بەبونی ئیبلیس هەیە، ئەگەر نە چۆن دەمتوانی بوونی ( لۆرد بیڤەر بروك) هەست پێ بکەم؟

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما
07701574293

نرخ (3500) دینار